شیعر

# عەورەتی گەڵا

سیروان ناشاد

٢٠٠٧





ناوی کتێب: عەورەتی گەڵا
بابەت: شیعر
نووسینی: سیروان ناشاد
دەرهێنانی هونەری: فەهد شوانـــی
موتیڤ: زمناکۆ
کۆمپیوتەر: نووسینگەی (هیــوا)
چاپی دووەم – ٢٠٠٧

## سیروان ناشاد

سیروان ناشاد کەسێکە لەمنداڵییەوە دڵی شکاوە، وەك خـۆی دەڵـێ: ئاوێتەیەکە لەشەرم و تەریقی، بۆیە رەنگە لە ئێوارەیەکی پایزیی لەژێر دار کالیبتۆزێکـدا، بـەدەم خوێنـدنی وێردەکـانی فیراقـەوە لەشـەرمانا سوور هەڵگەڕێ و لەتەریقیدا وەلادا بێ و بمرێ، کچێکیش نـەبێ وێنـە گەچڵاوەکەی لەئەلبومی بیرەوەرییەکانیدا هەڵبگرێ.





بـــە/

* دایکم هەتا هەتایە گوێیەکانم لەئاوازی لای لایەو هەنسك و نوزەکانی پڕ جۆشترو خۆشتر نابیستن.
* سۆزەی هاوسەرم فریشتەی دەفتەرداری خێری سەر شانی ڕاستم.
* (سارا) کەوەك خونچەیەکی لێو تەڕم بینی، کەچی دۆڵفینێکی عەیارو کۆدرزێکی هیشك بوو.
* سارای کچم .
* ئاسۆ بابان
* تـــۆ

پێشکەشە

***ناشاد... تریقەی شەپۆڵێکی مەنگ***

***ناشاد... قرچەیەکی تورِ هەڵدراو لەپوشپەڕ***

رووکارت شێوەی دووکەڵی بغوری گرتووە، ماتیت لەخامۆشی گۆڕستان دەچێ... چەقاوەسویەکی کپیت، بەم ڕۆژگارە خەریکی هەڵدانی کۆلارە شەرمنەکانی بەپەتی گوناه، قاچەکانت لە خاکێکی سووتەمەڕۆ هەڵسواوە.. بەزۆر ئەتەوێ ڕاکەی.. ڕاکەی لەو کوڵلە کوێرانەی گوڵەگەنمی تەمەنێك پارە دەکەن، ڕاکەی بۆ ناوخۆت.. لەناو (بوون) تا کەپرێ لەغەدر هەڵدەی، ئەتەوێ بچیتەوە بۆ ناو خۆت نەبادا سیسرکەکانی چوار دەورت هەڵتلووشن و وەچەیەك شەرم بەهەتیوی بەجێبێڵن.

ئەزانم بوخچەیەکت لەشەونمە مەیوەکانی سەر ڕێحانان کۆکردۆتەوە.. ئەتەوێ لەتەنگاوترین ساتی ژیانتا لێوی ئایندەی پێ تەڕ بکەی، کەچی نازانی نازی ئەم ڕۆژگارە چەند قورسە، ئاگات لەساباتی سۆزگەری نەبێ کۆشکێکت لەهەڵمی عەدەم بۆ دروست دەکات...

چاك دەزانم دڵەمەیەکیت لەگوناه و ویژدان، هەر بۆیە بەمەلوولی سینگت وەبەر هەنووکەیەکی پڕ لەبارانەوە ناوە لەهەڵگەڕان بەرەو لووتکە..

**ئاسۆ بابان**

**سۆندسڤال/ سوید - ١٩٩٩**







## سەوڵ

**چۆن دەتوانین ماراسا بەسەر رایەخی دڕکەزییا بخزێینە نێو پێچەکانەوە**

**کەشەلاڵی برینانین**

**بەم قیبلەنوما ژەنگاوییەوە چۆن لەتاریکستانی ئەم دەڤەرە هەڵچووە ڕێ**

**دەرکەین**

**بەم جەستە سوتاوەوە ڕۆژ چۆن دەکرێتەوە**

**سواخم دە**

تاقەتی بینینی ئەم هەموو درزەت نییە لەتریقەی بێوەژنان دەچێ
دامپۆشە ئەم لەرزینەم زگماکییە
بەنێو پێکوڵەو قالۆراندا [*]
ئەم پێیە شەقارە لە سەرەندەکەی گەرمێن دەچێ
نەنکم لەسەر چیخەکەدا جێی هێشت و چوو
لەژوورێکی دوای کپ بوونی غەریزەکان دەچین
کفت و کەمجووڵەو کەوتوو
وەک لاسکێکی مەینەتبار بەشنەیەک دەشکێین
تۆپە بەفرینەکانی وەهمین بەسەرخۆدا دادەچۆڕێین
خۆڵە کەوەی دەم رەشەبای قەدەرێکی لێڵین
پێکراوی نێو تەمێکی رێ ونکەرو هەر بەئاستەم وادەجوڵێین
بێئومێدی ئەو دەنکە پەرسیلە وەریوانەین
لەچاوەڕوانیی خۆرەتاوێکدا ببنە ترێ
ساچۆن لێوی سارایەکی سەراباوی ئاودێر بکرێو
بەماچێکی شێدار دڵی زەوی ئاشت کەینەوە؟!
بەم قرچەی سوتانە ئەسەف کەناتوانین
کۆلارەکان بەپەتی خۆشنوودی هەڵدەینەوە!
ئەی پاشماوەی مەرگەساتەکان
روو وەرگێڕە فریای بۆ کرۆزی نێڵەکانم ناکەوی
سیغارە ژەنگاویەکەی رۆژگارم
سووتوی جغارە عارەبییەکەی باپیرەم





هاورێکانیش لەبیابانێکی لماویدا جێیان هێشتین
ئیدی لەم لمگەیەدا قیبلە نوماکان کوێمان دەبەن
جووتە پۆڕێکی نابەڵەد بەیاسای قورسی راوچی
جووتە ماسییەکی کەم ئەزموون بەردەم تۆڕی خیانەت
دووباڵندەی پەڕ وەریو لەپەرێزی داودا
دوو سوێسکەی تازە جوقاو لەنیشتمانی تەپکەدا
تەنها دووبزەی مانگە شەو بێئاگا لەتەمی ڕێ
چەترەکان داخەن بارانێ درزەکان تەڕکا
دڵۆپێ لەگۆناهانمان بچۆڕێ
تەعاروفێک لەگەڵ راهیبەیەکدا بکەین
پیاسەیەک لەگەڵ جۆگەلەیەکی سەرەڕۆ
هەنسکێک لەکن کانییەک هەڵرێژین
سەرگوزشتەی بەردێک هەڵکۆڵینو
پەشیمانیی تاوانێک بنێژین
چەترەکان داخەن
هود هودەکان پەیامێکیان نەدا
کەسولەیمانەکان بەسەر گۆچانەکاندا نوشتانەوە
ئامێزت مەکەوە فریشتە بەڕوی ئەم کوناهانەدا
خۆت مەدە دەس سەوڵەکانی ئەم کەشتێوانە غەوارەیەو بێرەحمەدا
پەموی ژانەکانت مەسوە لەدڵرەقی چقڵەکانم
ئێی بەستەزمان

وەتدەزانی پەرسیلەی کامەرانی دەچنی

هێشوەکانیش بۆنی خەردەلی خیانەتیان گرتبوو

کەوەکان لەژێر تارای دێوەجامەکاندا بانگی خیانەتیان دەدا

گۆمەکانی ئاسوودەییش قوڵ قوڵ کەفی خیانەتیان دەکرد

کەنیشکەکان لەپاڵ کورە دەس زبرەکانەوە

مومارەسەیان لەگەڵ  رەشەبادا دەکرد

خیانەتکار خۆمان

تەزویەکمان وەلەشدا نەهات  لەپاککردنی لالەنگی نیشتماندا

بەسوێرەشکی عیشق غوسڵێکمان دەرنەکرد

لەباسکە مەلەی ژیاندا

نوێژێکمان دانەبەست لەتەقسی حوجرەی سوتاندا

حاڵی نەبووین چ کەیفێکە شینو ئەوین  لەشەواندا

خودایە

تازە دڵی چۆلەکەیەکمان پێ ئاشت ناکرێتەوە

بەلێواری گوێسەبانەکەوە بووبە چلوورە

ئیدی فرمێسکی ئەومناڵە لێمان خۆش نابێ

بێ گوناە لەرەحمی زەمەندا  مەیی

نوزەی ئەو مێروولەیە نابڕێتەوە بەگەورەیی پێمان لێنا

شەوکوێر بووین  لەهاوەڵی (یوسف)وگورگان خوارد چووین

خودایە

چ حیکمەتێکە ئەم بوونە





چ سرێکە ئەم گەردوونە

واین بەلوتکەی ئۆرگازمی تەنهایی

بەچڵەپۆپەی ژانەوە

کۆتایی چ مەرگەساتێکمان بەشبوو

(کلاشەکانمان دڕاو چمان پێنەبڕا)

ژیان:  کناچەیەکی چاو قەرسیلی بوو ئیغتصاب کرا

نیشتمان: حەرفێك بوو نەخوێنرایەوە

عیشق: نوشتەیەك بوو بەتاڵکرا

زیندەگی لەحیکایەتەکانی نەنکم دەچوو نیوە شەوان

لەگەڵ نەرمە (با) یەکی ڕچیو بەنێو لچی خشتە قوڕینەکانەوە دەهاتە ژوور

هەردەڕۆیشتین ونەدەگەیشتین

جاچۆن کچی پاشای  بەختەوەری مارەبکەین

هێی بەستەزمان

هێشتا نەمانزانیوە سەرابە ڕێی ئەم غوربەتە نامانگەێنێتە هیچ

لەنزای چەپڵەکانیش نەگەیشتین

ئومێدی گوڵە دالیاکان بەهەڵەتی هەڵدێرا بردین

(کلاشەکانمان دڕاو چمان پێنەبڕا)

وەرە هاوڕێ لەژێر ئەم (بی)یە رەزا قورسەدا

دیژلەمەیەکی کامەرانی فرکەین

کامەرانی لەنوکتەئیکسپایەرەکانی ژیان دەچێ

وەرە لەزەماوەندی بوکێنی نیشتماندا سەرچۆپی کێش بە

شاتووەکانی فیراق لێرە بەر دەگرن

درەختەکانی موعانات هەمیشە سەوز

ئێرە وێسگەی کاڵبوونەوەیە

وەرە ماڵێ لەنێو قامیشەلانی پەنجەکانما چێکە

ببە نەرمە (با) یەکی تەزیو خۆڵەمێشی ئەم روحەم برەقسێنە

ورد بنوارە

لەهەر کوێیەک ساوایەکی پێخواست دی بۆم بگەرێ

لەکام رەزا بەر چنەیەک ژانی یاقوتیت چنی لێم بگەرێ

کە بەسەر کەلاوەیەکی  سوتاوی گەرمێندا کەوتی من راژە چاوخۆڵە

مێشیەکەم

بالام شەنگە (بی)یەکی لەرزیوو تەزیوو تۆقیوو رچیوە

مەملەکەتێکم لەکۆس و قۆچ

وەرەو لەنێو گۆرێکی بەکۆمەڵدا بمناسەوە. . . وەلێ

(ناسکۆڵە گیان بگری، بەر خۆڵەگیان بگری

لێرە پەیدا نابێ شەدەو گوارەو هەوری)

لەدەرگاوە مەیەرە ژوور

نەبا وردە شوشەی زەمەن نێڵەی هەناسەکانت لەتکا

من تۆزی ئەودیو مێژووم پێوەیە

خۆڵەمێشی دوای ئەنفالم

ولاتێکم عەینەن لەدارە مەیت دەچم

ئیدی دیوارێک لەگوڵە بەیبوون و پەنجەرەیەک لەتریفەو





سابیتەیەک لەرێحانەو کارێزێکی سەخی لەتوربەی کام عەتاردایە

ئەی شۆخ . . .  دوا نوزەم لەپیاڵەیەکی لێوشکاودا بخۆرەوەو

بەمەرگێکی هێمنترم بسپێرە

خودایە لەگیرفانی کام عەوداڵی خەرامان

صورەیێ نیشانی خورشیدەکان دەین

ئەوانیش دەرەقەتی دێوان نەهاتن

ئەوەتا لەتاقەکاندا ئابرۆی شیرینان دەتکێ

ئیدی کلاورۆژنەیەک بۆ ئۆخژنێ

مەگەر لەماچە گەرمەکانی هەنیەو خاکدا

بزەیەک بۆ ژیان لەسوحبەتی شەوە گرینۆکەکاندا

زنەیەک  بۆراموسین لەچاوی تێرامانی کەوندا

واین بەچڵەپۆپەی گوناهەوە

بەلوتکەی ئۆرگازمی تاوان

وای خودایە گیری چ مەرگەساتێکین؟!

چۆن دەتوانین ماراسا بەسەر رایەخی درکەزیا بخزێینە نێو پێچەکانەوە

کەشەلاڵی برینانین

چۆن لەتاریکستانی ئەم دەڤەرە هەڵچووە ری دەرکەین

غەریقی بەحری تاوانین

سواخم دە تاقەتی بینینی ئەم هەموو درزەت نییە

دامپۆشە ئەم لەرزینەم زگماکیە

(*) پێکۆڵەو قالۆر: دووجۆرە درکن

# تلیسـان

بەمەراقە مزرەکانی هاشم سەراج پێشکەشە

لەچی دەرِوانی
ئیدی قارچکە خەونێک لەسایەی زرافە باڵای (بی) عەیارێکدا دەرناچێ
کوێوە دەچی گوندییەک پێی وتم
چەخماخەو تریشقەی عیشق سووتاو ئەم خاکە سوتماکە مەمکی
دومەڵانی
حەزێک دەرناخات
بیرلەچی دەکەیتەوە
تازە عەردی گوناهەکان پەڵەیان داو کەستەکی ژین تلیساوە





دوا ئایەتی سەمای وردە زیخەکان بەتاڵ بوون
کانییەکی کوێرو کارێزێکی چاوکز پێیان وتم
ئاوەرِ بۆ کوێ
کچە عەیارەکەی پەچە ئەوێ دەمێ لەگەڵ ماڵینی قشپلەکانی بەخت
داماڵراو بێ سۆراخ کەت
بنوارە
رەشکەو هەگبەی خەونەکان لەکۆندەرەی تەمەن‌و لەزستانێکی تووشدا
چیان لێهات
کاروانی کامەرانی بەدەس قیبلە نومای درۆزن‌و سەمەرەکانی
ئەستێرەی رێ
ونکەرەوە چۆن فەوت بوو
دەتەوێ گڵی مەرقەدی چ پیرێک ئۆخژنێ وەلەشی سرِدابێنێ
لەم لمستانو وشکەڵانەدا مشتێک خۆڵە سوورە پەیدا ناکرێ
غوسڵێک دەرکەین گولین گول
ئیتر سەمفۆنیای گارە گاری مامرەرِەشە نابیستین هێلکەیەکی
بەختیاری لەرِەزێکدا بدۆرِێنێ
بە(موی سپی)ییەوە رێ لەچ چاو رِەشێک دەگری؟
بێڵەقانەی تەمەن لەهیشکە عەردی باران نەدیو دانی وەری
لەکوێ کەنگری عیشق دەرهێنێ
شامیلۆک-ی هەڵەتی جوانی (پیر بوو پیر)
سولەیمان لەدوا ساتەکانیدا پێی وتم
رەدوی بەلقیسی بەخت مەکەوە کرم مۆڵەتی بوونی تلیس کرد
لەدەنک دەنکی تەزبیحە پساوەکە رامام

زەمەنێکی مەیو رۆژانێ رچیو جەستەیێ (خێرنەدیو ئاسۆو
سبەینێیەکی تەزیو تەزیو
لەکوێوە دەس پێبکەین
لەکولانەکانی چاوشارکێو راکە راکو قۆچە قانی
لەشێوانێکی نزیکو (هەرکەس نایا بۆ وازی)
لەبۆنی (تەختەی مەدرەسە)و عەجولی و بەرائەت وپاکی
یاکۆتا کەین (گەنم گرد جۆ بەلاو) (هەرکەس بۆماڵ باوکی)
لەنوکەوە بێهودەیە!
کاتێ بارە گوێزیان داگرت گوند ئاهەنگی ساڵوەگەڕی خانەنشینانی
دەگێڕا
کە کەشکۆڵی لەیستۆکە هێنرایە شار وەرزی زاوزێ بەسەرچووبوو
مناڵ قاتیی
وەختێ لەکلکەی ئاوایی ڕا هەگبەی مێوژ بەدەرکەوت
دانەکان کلۆر داگەڕا بوون
کەرەوە ولاخێك لەبەرچنەی لیمۆ بارکران
ساڵ ساڵی باویشكو پەتای نووستن داپۆشیبوون
کاتێ نامەی کوڕانی چیا بەکچە خرپنەکان گەیشت بەشوو چوو بوون
تازە سۆراخی مەرێکی لەڕان بەجێماو داد نادات مێگەل قڕبوون
چ کۆڵێك وەرزی ئاوەدانی لەخۆ دەگرێ
مینبەرەکان دوا ئایەتی سوورەی ئەنفالیان تەواوکرد
هەواڵی دۆزینەوەی زنەیەك لەتوربەی کام تەتەر دایە
سۆمای کارێزان داهاتو (مرواری چەوا) وخشکەی ماراسای جۆگە
لەڕەقساندن کەتوون





ئێی
کاتێ هاتن ماڵێ لەنێو پەنجەکانمان چێکەن هەڵوەری بوون
کاتێ شوێن پێکانمان کەتن مەحف بوون
پاکیزەییش بەلەشی پیسەوە لەتابوتێکی رزیودا رێکرا
بەبستە عەردێکی گەنیومان سپارد
هاتن گۆڕێکی بەکۆمەڵ بووین
لەنووکەوە
بێهوودەیە!
ئاڵقەی تەقیوی نیگاو نواڵەکان لەیەك بدرێ کەوشەنێکین لەترازان و
دابڕان
ئەمە یاداشتی شاعیرێکی رەشبین نییە
ئەمە حەقیقەتەکانی عومرە
دەتۆش ئەی شۆخ ئەی قەدەری پەنهانی سبەی
(ئەگەر هاتی نەرم وەرە نەبا فەخفوری نازکی تەنهاییم درز بەرێ)(*)
نەرم
نەرم
نەرم

* دێرە شیعرێ ........



# بەردەکانی گومان و پەنجەرەکانی یەقین

نەنکم گوتی
پەتی کۆلارەکەت  توندکەو
بزێوی چاوەکانت بسڕەوە
وریابە کاربۆنەکانی ژیانت لێنەکەوێ
بەیانییەو وەرە حیکمەتی چایەک فڕکەو





ریسی سبەینێی عومرت بۆ بڕێسم
ئەو ریسەی نەیدەزانی دەبێتەوە خوری!

وەک منالە جوێن فرۆشە عەجوولەکان
لەدەرگای  زۆر پرسیارم داو هەلاتم
بەدار لاستیکی تیژ هاوێژی گومان
شوشەو پەنجەرەی گەلێ قوتابخانەنەو ماڵی یەقینم شکاند
خۆمو رەوەمناڵێک
لاسارانە بەردی گریمانمان
لەهەرمێو نارنجەکانی خەیاڵ دەگرتو
لیکی تامەزرۆییمان دەسڕی
سنووری سەربانی هاوسێکانمان پێشێل  دەکردوو
قودسییەتی پەیمانەکانمان دەشێلا
خۆمو  رەوە مناڵێک
فیکەمان لەوکچو کوڕانە دەکرد  هەرزەکارانە لەعیشق دەدوانو
ترسنۆکانە لەتریفەی مانگ خۆیان دەشاردەوە
شەڕمان بەمناڵە مولتەزیمەکانی مەدرەسە دەفرۆشتو
دەفتەرەکانیانمان دەگەچلاند
ئەو دەفتەرانەی هەرەسی ئێمەی لێنوسرابوو
تارەتمان نەدەکردوو لەگوڵ  پاکتر بووین
لەدوای باوکمانەوە لەسەر لبادێکی بێنوێژدا

بانگی ناوەختەمان دەداو نوێژمان دەکرد
لەژێرەوە نەخشەی شەیتانیمان دادەڕشتو
لەحزوری خوادا بەریئانە پێدەکەنین
ئەو خودایەی هەرگیز دڵی لێمان نەدەڕەنجا
خۆمو رەوە منداڵێک
دەرسی توتیمان دەخوێندوو فێر نەدەبووین
لەقەفەسی مەیمونەکاندا وانەی هەڵپەرینیان پێدەگوتین و رام نەبووین
دۆشەکی مەرگو کپییان رادەخستو ئارام نەبووین
خۆمو رەوە منداڵێک
گشت سپێدەکانی عەجولی لەپمان بەداران سڕ دەکرا
داری حەددو داری باوکو داری مامۆستا مولتەزیمەکان
ئەو مامۆستایانەی فێریان کردین دارا تەنها دوو داری دی
فێریان کردین تەنها مام زۆراب مێوژی نایاب دەفرۆشێ
خۆمو ڕەوە منداڵێک بەریئانە عەجوولو لاسارو چەقاوەسوی گەڕەکبووین
بەریئانە یاخیو کێویوپڕ کەڵەک بووین
دارا بەدیار دارەکانەوە ریشی سپی کردوو
مام زۆرابیش مێوژی ساڵی خستینە دەمەوە
گەورە بووینو لەگەڵ هەڵدانی کۆلارەی باڵاکاندا
قەزەمتر بووین
لەگەڵ ژاوە ژاوو گوتنەکاندا کپ و کپتر بووین
وەک نەردێوانێکی پشت کوڕ چەماینەوە





وەک بێدەنگی پاشماوەی شەڕگەکان بەتاکو تەنیا ماینەوە
چون لاسکی خەرتەلەیەکی بوواری زوو پیر بووین
وەک زنەو چاوی کانییەکی باران نەدیو کوێر بوینەوە
کاژی بەرائەتمان لەخیانەتەکانی شەودا فڕێدا
گەورەبوینو وەچەیەک شەرمو ریسوایی لەگەڵماندا گەورە بوو
شەرم لەو منداڵەی تنۆکێک فرمێسکیمان نەکردە یاقووتی گەردانەی مێژوو
شەرم لەو خوشکەی ئێستاکەش خوێنەکەی لەقۆرتێکدا
نیگاری پاکیزەیی دەنەخشێنێ
شەرم لەو ریزەخالانەی لەچەناگەو مەچەکی تەمەن کوتامان
شەرم لەکانیی سۆزی چاوی ئەو لاوەی لەدوا هەناسەیدا دەیگوت
کاشکی دەمزانی بۆ دەمکوژن
گەورەبوینو وەچەیەک شەرمو ریسوایی لەگەڵماندا گەورە بوو
ئیدی بەڕوی رەشەوە چۆن لەدەرگا سپییەکانی دڵی نیشتمان دەینو
پێی بڵێین قوسورمان عەفوکە
بەبەرچنەیەک گوناە و رەشکەیەک تاوانەوە
بەکام دەمەبرینی بەسوێ بڵێین لێمان خۆش بە
نیشتمانم.. کە گەورە بووین خەونەکانمان وەک کەلاوە قوڕینەکانت
بەدەم شەستە بارانی ناوادەوە پاکی خوسا
کە گەورە بووین هەڵماتەکانمان وەک تەرزە خوێناویەکانت
لەچاڵی بیرچوونەوە جێهێشت
بەردەقانیەکانی گومانمان بەیەقینی جەنگەکان دۆڕاند

وردە سۆزو نامەخەت ناخۆشەکانی دڵداریمان
لەبلیاردی شەرگەکاندا خوسا
لەژێر دار بییەکی پەنجە تەزیوتا نیسکافەیەکی خۆشنوودیمان
لەگەڵ یارا نۆش نەکرد
ئەوداربییەی تەنها تابوتێکمان لێدروست کرد
نیشتمانم
لەپەرێزێکی سوتاوتا دەفرێ دۆی کامەرانیمان
بەکولێرەیەکی وەسڵەوە نەخواردەوە
ئەو پەرێزەی بوو بەمەنجەنیقی بێچووە سوێسکەکانی چارەنووس
ئەو سوێسکانەی نەیانزانی
بەچ گوناهێک دەسوتێن
لەچاخانەی عومردا قەندێکمان لەگەڵ کچەچاوقەرسیلیەکانت نەشکاند
ئەو قەندانەی لەتازیەکانی ئێمەدا
پیرەکان بەدەم پێچینی سیغارەکانەوە دەیانقرتاند
نیشتمانم.. باش لەبیرمە نیوە شەوێکی زستان بوو
وەک کاغەزە دراوێکی لەت ورد کرایتەوە
لەو کاتەوە کەمن لەدایک نەبووبووم‌و بەبیرم دێ
نوقمی خوێن‌و تەم‌و رشانەوەو دووکەڵ بوی
تۆش هاورێی گیانی بەگیانی من
ئەی ئەو مرۆڤەی وەک ئومێدەکانی خەیاڵ لێم ناگەرێی
ئاگام لێبوو خێرا خێرا قاچە خوێناویەکەت دەدا بەکۆڵداو





دەوەن دەوەن رێگات دەبڕی و نەرم‌و هێور هەنسکەکانت دەکەوتن
بەنێو تەرم‌و بارووت‌و سەنگەردا غارت دەدا
گلێنەو سۆماو خەونی سەرگۆڕەپانی شەڕت دەچنیەوە
ورد دەترووانی لەئاواتی کوژراو، پەڕەسێلکەی گرینۆک
شاباڵی هەڵوەریو، نوزەی جێماو
بەشەرمەوە رادەمای لەسوتوی خاک، فوارەی خوێن،
لەغلۆر بوونەوەی ئایەتەکانی دووگوردەکان، لەقوڵپەی ئاو
ژیانت لەدارە مەیتێکدا بینی و مەرگی ئازیزانت دەچنییەوە
هێشتا دەتگوت (با شنەبا ئارام بنوێ)
بەبیرم دێ ژیان کۆرپەیەکی لێو تەڕی لەئامێز گرتبوو
شۆخی لەگەڵ سپێدە شەرمنەکان دەکرد
ئەوکاتانەی عەیارانە کۆستی کوکوختیەکانی دەشاردەوە
تاوەبارانی بوواران سوحبەتی بەکوڕو کاڵی گوند دەکرد
ئەو دەمانەی قابیلەکانی قەدەر نەخشەی مەرگی براکانیان دەنوسیەوە
هێشتا بێ خەبەر بووین چارەنووس (خاوکەر)ێک
لەنێو ژێی رەبابەیەکی نەشازدا دەخنکێنێ
نەماندەزانی گەڕیدەی خەرامانی شۆخ لەتینواندا لەفوراتدا دەخنکێ
بێ ئاگابووین نەوەکانی سەعدی خەونەکانی زارۆکان
بەچوار چرایەکەوە هەڵدەواسن
-با-یەک لەبیابانێکی وشکەوە هەڵیکرد
بیابانێک گێژەڵۆکەیەکی عەگالیی لەسەرنابوو

وەک خانەخوێیەکی سەخی نیشتمانم دەرگای دڵی والا کردوو
لەکۆشی ناو توند رایموسی و توند دەیمژی
وەی لەفەقیانەو دەسرازەی هەڵوەشاو
وەی لەزیرەو قریشکەی چەم
نیشتمانم کچێکی چاو قەرسیلی داوێن پاک بوو
بەبوختانی دراوسێکان
بەرۆژی روون براکان کەوتنەگیانی و بسکیان بڕی
بەنینۆکەکانی خۆی چاوەکانیان هەڵکۆڵی
ئەو نیشتمانەی پەنجەی بەخەنەی حوزن و قژی بەشانەی فیراق و
چاوی بەکلی قۆچ ڕشتبوو
ئەونیشتمانەی بۆنی مسکی لەتبوونی لێهەڵدەستاو
شەوێک نەهات سەرخەوێکی پێ بشکێنێ و
سەحەرێک نەبوو برینی لاوکێکی سارێژ کات
لەوێ نەبووم و بێ خەتابووم کەباڵی نەورسەکانیان کردوو
چەمیان پڕ زریکەکرد
کەلووتکەکان بوونە مەتەرێزی جەنگ
هەوێنی رەحمی هیچ ژنێ نەبووم کەبزرکاین و نەمەیین
کاتێ هاتم بەسەر نیشتمانێکدا کەوتم
جێی تەراتێنی مشکەکان بوو
پایتەختی ئەو مەلیکانەی بەر لەبوونم سەربازان بەکوشت دەدەن و
جارێک کش ناکەن





بەسەر ماڵێکدا کەوتم نمەک شوێر بوو
هۆ هاوڕێی گیانی بەگیانی من
ئەی ئەو مرۆڤەی وەک ئومێدەکانی خەیاڵ لێم ناگەڕێی
بێ هودەیە (دار شەقەکەت زین بکەیت و بەسۆراخی مەغریبە ونەکەی من بچی)
بێ کەڵکە (ماچەکانی سارا بچنیتەوەو لەئینجانەکانی زەمەندا بیچێنی
تابەری ئەزموون بگرێ بۆمناڵانی سبەی)
تازە مناڵەکان باخێک نابیننەوە
هەڵوژەیەکی کامەرانی لێبکەنەوە
من ئێستاکەش (دارشۆڕەبیەکەی بەرچەمەکانی داخورپانم و
لەوەتەی هەم کڕنۆش بۆ قەدەکانی خۆم دەبەم)
کوێوەبچین دەستێ ئارام وەقژی گڤنی خەمەکاندا بێنێ
مەگەر لەگەل سەگەبێ کوخ و لانەکاندا
ئەو سەگانەی بێ هاوەڵ و بێ ئەشکەوتن
نیوە شەوان تاوێک بێ کەسەربژین
تەنها لەئاودەستخانەکاندا خەیاڵێک شک دەبەم
دێوەجامەی سەرکەناریەکان هەڵدەماڵێ
ببیەهاوڕێ نزاو سەداو نوزەی سورمێ
کەملی ئومێدەکانی بەتاوێرە بەردەکانی سیپان لەتبوو
(خورشیدێ توو لەکوێندەری دۆت مامێ تە فیرارە، مەحکومە،
کەتیتە وەراتێ غەرێبیا)
خورشیدەکانیش نەهاتن

کاتێ هاتن دەمێ بوو مەمکە فەریکە سێوەکانی سورمێ

بوو بوون بەمشتێ خۆڵەمێشی ساردوو سڕ

کاتێ هاتن گولاَن شیلەیان چۆڕاوو لەکچێنی کەوتبوون

کاتێ هاتن لەتاقەکاندا ئابڕوی شیرینان دەتکا

ئەمە ئەو خەونە بوو هیچ فاڵچییەك پێشبینی نەكرد

هیچ عارفێك نەیدەزانی

هیچ لۆچی ناو لەپێك ناچوەسەری

ئەمە خەون نەبوو ڕاست بوو

ئەمەسەرگوزشتەی زرکە کاڵەکی بێستانی نیشتمانێکی خۆرە بردوو بوو

خۆمو بوخچەیەك لەشەونمی ڕێحانان

بەخێرایی لەجادەی چارەنووس پەڕینەوە

نەبا شوفێرێکی کوێر بەچاویلکەیەکی تۆزاویی بمانشێلێو

بەم قرچەی سوتانە (با) یەك نەبێ بۆنی هەناسەو

گلەیی ڕێحانان پەرش کا

دڵڕەقانە لە منالانی نێو زەلکاوەکان رادەمام

کەدەبوونە پیاوی تاعوون‌و برسێتی وخەم

جاویدانیم لەچاوی ئەوبێوەژنەدا دەبینی

کەزوخاوی دەنۆشی و شنەیەك نەبوو نێڵەکانی پەخش کا

بێئاگا بووم لەوکرێکارەی بلۆکی دڵڕەقی زەمەنی هەڵدەگرت‌و

(با) یەك نەبوو ئارەقەی هەنیەی بسڕێتەوە

پێم گوت سەعات چەندە؟





نەمدەزانی ئیدی زەمەنێکی نییە بۆژیان

بەبزەوە پێی گوتم گەرەکی ئێمە کەدەکەوێتە ئەو دیو ماڵی مێژووەوە

بابەلباب لەگەڵ زەمەندا ناتەباین

هۆ هاوڕێی گیانی بەگیانی من

ئەی ئەو مرۆڤەی وەك ئومێدەکانی خەیاڵ لێم ناگەڕێ

ئەمە خەون نەبوو ڕاست بوو

ئەوەی لەگمەی کوترەکان وەرمگرت‌و

لەمشتێ خۆڵ‌و بەرماڵێك چنیمەوە

ئەوەی لەنێڵەو نزای دایکان یاداشتم کردو

لەچەتری ئیرادە فێری بووم

تەنها نیگاو ئاواتێکە بەتامەزرۆیی دەیبڕمەڕێ

ساخودایەهاوار بۆتۆ

ئەم خەونەشم وەکوو باڵی نەورسەکان هەڵنەوەرێ

ئەوسا خۆم و ڕەوە منالێك

بۆنی پونگە و سمڵمان لێدەهات

پاك بوین وەك وردە زیخەکانی نیشتمان

جوان بووین وەك شەرمەکانی کەنیشکە بالق نەبووەکان

قنج بووین وەك خەونەکانی منالێك کەنازانێ چۆن وەیگێڕێ

گەورەبووین‌و بوین بەدەرختێکی پۆشاك شڕی زڕ

بەگەڕەکێکی چۆڵ‌و بێ جوولەو سڕ

گەورەبوین‌و وەچەیەك شەرم‌و ریسوایی لەگەڵماندا گەورە بوو

**گەورە بووین‌و بووین بەهەموو شتێک**

**وەلێ ئەفسووس تەنهاو تەنها عاشق نەبووین**

**۲۰۱ هەولێر**

تعتبر قصيدة (عورة الورقة) للشاعر(ناشاد) من خيرة ما أنشدها من القصائد حتى الان، ويرجع ذلك الى ما تحملها في ثناياها من مضامين فلسفية عدة، حيث تتراوح في تفسير النص بعبارات ومدلولات جمة، سواء كان من الناحية المادية أو الرؤية المثالية للنص الشعري، ففي كلتا النظرتين يتضح للقارء بأن الشاعر ينوي، او الاصح ان يقال بأنه يتأمل في خلق نزعة راديكالية شاملة في الحياة المسيرة ونلتمس تلك الحقيقة في اللغة والرؤيا الشعريتين والتي تسودان القصيدة المعنية لناشاد. . . فعلى الرغم من اشكالية وتنوع الافكار التي تتضمنها القصيدة الا انها تتسم بتماسك فلسفي شكلي اساسي بحيث لا يوجد اي تفرع ثنائي بين المعاناة الازلية لولادة الانسان او الطبيعة الخلاقة، فكلاهما يستنتج لدى الشاعر يقينا ميتافيريقيا لتفسير هدف الحياة. . ومن ثم يغرق الشاعر في محيط الزمن حيث يلتمس طريقة الى المعرفة، معرفة ماهية الحياة المسيرة للانسان اما مايخص الشاعر نفسه، فقد لعبت عدة عوامل في رفع مكانة الشاعر منها القاؤه المتميز وصوته وقدرته على ايصال الكلمات والمعاني الى المستمعين، حيث لاتتنعم بطعم وطراوة اشعاره الا في حالة الاستماع لانشاده القصيدة. ويرجع ذلك كله الى مقدرته على التمثيل والحركات في اللحظة المناسبة عند





ألقائه الشعر.

**صابر حسين**



## عەورەتی گەلا

**ناچمەوە نێو دارستانە چڕەکانی تاریکی و هەنگاوەکانم**

**بەغەیبانییەتی ڕێگا ناسپێرم**

**تخووبەکان هەناسە سرکەکانم رام ناکەن. . .**

بەگریان هاتم بێدەنگ ناچم

بەچاوی غەریزە بەرانییەکان لەجەستەکریستاڵەییەکان نانوارم

ختووکە جناوییەکەی سێبەر هەنگاوە نەبانەکانم کێش ناکات

دۆلکەی موسافیرانم ناوێ بالای بەرزی روناهی لەبیردا ناتاسێ

هەرتک گوێیە تەزیوەکانم دەبەشمە هەناسەی نەخشینێکی گەرم

کەپنەکو گۆچانو کوڵە باڵ لەمۆزەخانەی ژووری جوتیارێکدا

هەڵدەواسم

لەکلاو رۆژنەوە مشتێ تیشکی پاکژ دەخزێنمە پانتایی ناخمەوەو دەجەنگم

شەرِی قەفی بالاوکرم

پێو ژاژ

کاژمێرو هەنگاو

لێرەوە سیحری داخراوی نوشتەکان بەگۆچانە موساویەکەم بەتاڵ دەکەم

لێرەوە منالیی پرسیارو یاخیبوونو گومان دەنووسمەوە

* * *

هەڵم نوشتەی ئەزەلییەتی رازەکان

لەنێو بسکی قەف قەفی شێدارتا سیحری هەڵکشانو بارانو گوڵ

دەدرکێنی

وەلێ نیگا پەرتەکانمان لەروانینێکی تۆزاوی چیتر نەبوو

(با) گەرۆکترین گەریدەی ئەستێرەیەکی لێخن

(با) کەڵەشێری گەلاو گوڵو خوڵو هەوەسباز

ئەدرێسی دالیاکان نانێمە لەپە لووسەکانت نەبا بخزێن

دەی هەناسە گولاویەکانی گوڵترین دەم ئارەقی رووحی شەکەتم وشک کە





دەی چپە کەوی نەکراوەکانی قەناری رووح

وەگوێی چرای کز، بێدەنگی بەرد، دەڤەری جەنگەڵ، سوراحی قیژە

برژێنە

یاداشتی ئاوێنەکان بوو پەڵەکانی هەنیەمان چۆرِا

گوناهی پێکەنینە بەهەڵمبوونی ئاونگی رووح

گریانی هەوربوو کانی رەشبەڵەکی گێرا

خەتاباری ئەستێرەیە کاروان کوژرا

میهرەبانی مانگە شۆستەکان بوون بەزێر

تێنوێتی سارا بوو زنەکانمان راموسی

دەچمە بنی بنی دەریاکانەوەو دەبمە هاوەڵی دۆلفین و مەرجان

تا لەوشکاییەکانی یاوەریی کوللەدا نەختکێم

دەسا ببیە ئاهی دوای داهێزرانی رووح ببیە

تا ئەستێلکی چاوت لێو دەبێو دەشکێ

دووبارە توخمەکان دەخوێنمەوە

زێدی یۆتۆپیا لەسەر کیشوەری لم و چاوە هیشکەکانی سارا

دەسرِمەوە

باڵی خەیاڵی (زاجل)یم لەیەک دەدەم وەدووی عیشقێکی گەورەدا

رامانەکان رەدوی سەفەری مەسیحو

چپە چەپێنراوەکان ئاوێتەی زایەڵەی هەللاج

ئەو خەونانەش تەلاق دەدەم نیوە شەوێک بەبوخچەیەکەوە تاک

لەگەڵ بینینەکانم جووت نەبێ

گوناهی هەنگەکان نەبوو دەمێ بوو خونچە شیلەی چۆرِاو و لەعەزرایی

کەوتبوو
بێ چێژ و بۆن
من لەوێ نەبووم ئەو کاتانەی لەقیرتاوی دیرۆکەوە خزاینە نێو رژدی
بێشەکانەوە
هەوێنی رەحمی هیچ ژنێ نەبووم کە شیلەی بوونمان بۆنی سیری
لێنیشتبوو
هەڵبزرکاین و نەمەیین
زەرنەقووتەی ئەمەل کە چاوانی هەڵگلۆفین مەرگەسات بوو
خاکێکی زرِ، گوڵێکی سرِ، سابیتەیەکی قیرین، تەرمێ
لەسمکوڵانی ئەسپاندا لەوکەند و لەندەدا
بێ ئەزموونی سوارەکان بوو بەبزە تەمەن کورتەکانی سێبەر فیرودران
هێشتا رووتین و وێدەچێ کەڵبەمان لەزرکەکان چەقاندبێ و
تازە ژەهری سێومان نۆش
درەختەکانیش کەچەڵ بۆ گەلاێ عەورەتمان پۆش
درەخت... گەر تیغی خەزان کاکوڵی نەدەتراشی
ئێستە تیتکت لەئەستێرانرا گیر دەبوو
رووح... گەر دەریای رەهەندی بینینی سەفەرەکانیان لێڵ نەدەکردی
نابوویتەوە دۆستی جەستەی کەروو لێدراوی چەقیو
پەرسیلەی مەراقە تورشەکان بەنواڵەی غوربەت بوون بەترێ
لەلێو بووی دەفری هەنسکەکانی پەپوولە مەراقە مزرەکانی مازۆشیم
بەساددیەتی گوڵە عەیارەکان دەتریقانەوە پرِین پرِ
لەحەوشەکەدا چۆلەکەکان مەلە دەکەن بەفرێکی سپی دەبارێ





بەگریان هاتم بێدەنگ
ناچمەوە نێو دارستانە چرِەکانی تاریکی و هەنگاوەکانم
بەغەیبانییەتی رێگا ناسپێرم

*هەولێر / ١٩٩٧*



## ژنێك دەستی تەنیایی دەگرێ و سڵاو لەبێدەنگی دەکا

لەهالاوو نێڵەی هەناسە تۆزاوییەکانتا دەزانم خۆڵەکەوەی دوای
شەرِەکانی
بەبزە تفتەکانتا تێدەگەم دەڵێی ئیدی مانایەك نییە بۆ ژیان
گیتارێك بەدەم سرووده مەرگبارەکانەوە تەڵ تەڵ ژێکانی دەپسێنێ

تۆ کە دوێنێ لەولاتی مسکدا بۆنی پونگەی بوخچەکانی بوونت
لێـدەهات
چ زوو لەگۆمێکی قەوزاوی سەرە مێکوتەی خەونەکانت سپاردە تەنیایی
قورِباقەکانی کامەرانی لەمەغریبێکی زوودا مانیان لەبەستە چرِین
گرت و
گوندیان سپاردە بێکەسی
ئاگام لێبو لەگەڵ تەنیاییەکی تۆخدا چاوبرِکێت لەگەڵ بێدەنگی دەکردو
سلاوت بەو موسافیرانە دەدا بەئەدەبەوە سۆراخی سپێدەیان دەکرد
ئەو سپێدانەی لەودیو شوراکانەوە تەم دایپۆشیون
تۆکەدوێنێ لەهێشوە بەرسیلەیەکی ناسک دەچوی موچورِکت بەروحی رِێبواران
دەبەخشی
ئەمرِۆ لەنێو پاشماوەی جەنگەکاندا بەرامەی غوربەتییت لێدەتکێ
بەدووی ئاڵقەیەکدا دەگەرِێی بەیانییەک کردتە پەنجەی سەربازێک و
بەخشیتە دەس چاوەرِوانی
لەئێشێکی نیوەشەو دەچی بۆ دەرمانخانەی ئێشکچی قەدەر دەگەرِێی
لەورِێنەی مەینۆشێکی سەرگەردان نیوە شەوان دەستی تەنیایی
دەگرێ و
لەگەڵ لارە لاری زەمەن ساتمە ئەکا
وەک گۆرانییەکی هەڵبزرِکاوی ئەو مندالانەی دەزووی کۆلارەکانیان
پساوە
هەندێکجار لەگەڵ تەنیاییدا دەچیتە ژووان و سلاو لەبێدەنگی دەکەی





گەلێکجار تاس دەتباتەوە بەدەم چاوەرِوانیی ئەو کاروانەی هەر
نەگەییشت
« کۆچی یارم کۆچی سوورە
بەهارەو خێڵ بەرەو ژوورە »
چاوەرِوانی چیم لێدەکەی دەروونێکی برِێک شێدار ها لێوی کاژگرتووی
پێتەرِکە
سەیوانێک لەئیرادە سەر خەوێکی لەژێردا بشکێنە
هەناسەیەکم لەسینەدا هەڵگرتووە هێور هێور هەڵیمژە
هەنگاوێک لەقاچەکانم بەندە بیهاوێژە
چەند دەنکە گێلاسێکم بۆ سەفەرێک دانابوو هێدی هێدی بیکرۆژە
برِێک ژیان و ئاسوودەگیم لەسەردابی عومری پەرتبووم هەڵگرتبوو
ئەویش بۆ تۆ
قەیدی نییە لەنێو قامیشەلانی وشکەلانی هەناسەتا
برِێک خاکم بۆ هەڵکەنەو تیای بمنێژە

*٢٠٠٣/١١/١٣*

لەم دەقەدا شاعیر توانیوێتی ئەو هاوسەنگی و ڕێک بوونی قالب و ناوئاخنیە کەزۆر بەهێز (خوێنەر) دەکاتە (نووسەر)و نووسەر دەکاتە (لاوعی) و (لاوعی) دەکات بە(وعی) سازبکات و بەشێک لەخاسیەتەکانی کەم وێنەی تیوری شیعری لەخۆیدا بەرهەم بێنێ.

**سامان حوسێنی**

## سەفەری شالوورەکان

دێین و دەچین بەسەر
شۆستەو شەقامەکانا
تەمەن لێکدانی باڵی پەپوولەیەکە
ئای لەم چرکە پڕ خەمانە!
ئەمەدەمی جودا بوون‌و ترازانی خەونەکانە،
ماڵئاوایی دوا هەناسەی پەپوولەیە. . .





کناچەکان وەکو جاران ماچ پژێنی ژووان ناکەن
گوڵەکان بێ ڕەنگ‌و بۆ. . .
سەفەرە. . . سەفەر
کۆچی ئەو شالوورانەیە. . . دەمێ ساڵە
لەسیحری بێ وەفایی گوڵان دەگەن،
لەچاوەڕوانیی بێهودەیی شەونمەکان. . .
سەفەری ئەو خەونە بڵندو تەمەن درێژانەیە
لەهەڵهێنانی پێڵودا چاو لێک دەنێن،
کۆچی ئەو کازێوە پڕسیحرانەیە
مەغریبەکان دەیانکوژن. . .!
فریا نەکەوتین!
رازەکانمان وە(با) سپارد
لێوەکانمان وشک هەڵاتن،
پەنجەکانمان هەڵوەرین!
هۆ ڕێبواری تەنێی هەناسە سارد
خەمەکانت لەوە دەچێ لەمناڵدانی
ژانەکانی مندا گەورە بوو بن. . .
حەسرەتەکانت پێدەچێ:
بەشیلەی کەسەرەکانی من گۆش کرابن،
واپێدەچێ لەم بیابانە سارا وشکەدا
ڕێبوارێ گزی لێکردبی‌و

ماچێکی  سپی لەئۆقیانوسێکی سەختدا عاسی بووبێ!

ملی چ ڕێچکەیەک دەگرین؟!

ئەم ڕێگەیە هەنگاوەکان  کوێوە دەبا؟!

لەم چاخی هەرەسی ئادەمییەدا

بەرائەتی گوڵەکانیش تکا. . .،

لاجانگی مناڵانیش  سپی بوون و

بەتەوێڵی موریدانیشەوە گوناهـ لکا

گوناهـ،.. گوناه،

ڕامایت  ، ڕامام!

لەهەرتک دەستەکانتا:

مانووبوونی بێسەرەتاو کۆتایی

لەهەرتک چاوەکانتا :

«وان»ی عیشقێکی ئەبەدی و ئەزەلی،

لەچریکەو چپەکانتا هۆرەی چیایی.. !

چ سێڵاوێکە گوڵی من؟

چیە سیحری:

عیشق و. . .

کۆچ و. . .

سەفەر . . .

مردن . . .؟!

کەگرێکان دۆزرانەوەو





کەپۆستەکان خوێنرانەوە

دەبێ بمرین؟

سەفەر! ئای چ کۆستێکی تووش و ڕەشە!

چاو دامەخە

هەنگاوەکان بەدووی  خۆدا بەکێش مەکە. . .

ئەم زەمەنە سۆزانییە

کێ بەرکێی و یاخی بوونی دەوێ

هەڵسانەوەو  تێهەڵچوون و لەدایکبوون

لەنوێوە بوون

بوون. . .

شورای توندو تۆکمەی ئەوێ!

دەیان  ساڵە . . . جەستەی نەزیهی فریشتەکان

سووتەمەرۆو وردو خاشی ئەم دەستاڕەن،

تەڵ  تەڵ  ژێکانمان پساون و

نۆتەکانمان سەر بڕاون. . .

دەیان ساڵە:

(حەبیبە)کانی شارەزوورو گەرمیانم

لەسەفەرێکی

دوور

دوور

دووردان و

بەحری مرواری دەڕێژن

دەیان ((نالی))ش بەدەم زیکری فەنابوون و

ئەوینێکی شێتانەوە

دوا گۆرانی لەغەریبیدا دەنێژن!!

١٩٩٦

گەر بەوردی لەستراکتۆری (ئەمارەتی شخارتە) بـڕوانین، دەقێکـە زۆر وردەکاری تێدا کراوە، لـەپاڵ هـەر وێنەیەکیـشەوە مـەدلولێك دەبینرێ، روانینەکانی شاعیریش لەچوارچـێوەیەکی قـەتیس بـوودا نامێننەوە لەهەمبەر ژیانێکی پڕ شەڕو کوشتار.

**سەدیق سەعید رواندزی**

# ئەمارەتی شخارتە

"بەو قەرەجەی لەشەڕی وەچەکاندا قاچەکانی مەزاد کراو لەشەڕی پەلکە زریانو باراندا گلەییەکانی فرۆشرا، هێشتا دەیگوت: با شنە- با- ئارام بنوێ. . . بابان"

بێ ناز وەکو پرتەقاڵە کەوتووەکانی کۆڵانی خواپێداوەکان
تەرمێ بەرێدەکرێ
دەبێ قەدەری کام گۆڕستان بیگرێتە خۆ
لاواز چون ئەو حەرفە هەتیوانەی بەهەنسکەوە





لەشەوێکی تووشو رچیو دابارین
لەڕۆژێکی گوڕەی گەرما لەساباتی قەلا موچڕکە بەخشەکانی سینە
کچەسادیەکان وەدەریان نان
ولاتێکم لەتاوتێکی لێڵو مژا عەیامێکە بەسەر چوار کۆڵەوە چەقیوم
نەدەنێژرێم بۆ تەڵقینێ
نەموجیزەیەك پێدەگرم
داد
تەرمێکم مردوو شۆرم مێژوویەکی پڕ نەفرینە
لەزانمدا چەقۆیێ کول ناوکی بڕیم
بۆ هەمیشە ئەو زەوییەی خوێنپۆشکرد دەکەوێتە نێوان منو دایکم
بنوارە فوارەی خوێنو
جەستەم یەکپارچە
برین و
برین و
برینە
کەبەسەر شمشێری کەونا دەتکێ
مەلەوانێکی نابەڵەد بەدرزە هیشكو زبرەکانی سارا
لەقلەقێکی بێ ئەزموون لەدوورگەکانی فڕین
زاجلێکی پەڕ هەڵوەریو پەیکێکی شوناس گەچلاو
کەناریەکی گەروو لەتین . . سلاو
سلاو لەبرا گچکەکەم قەپێلکی بەتاڵی ئەمارەتی شخارتە دەناسێ
سلاو.. نەنکم پردی هەنگاوەکانی کردە خوری

ئاتاجی ئاب‌و تابی ئاوین
سورەتی لەندو کۆندەرەکانی عیشقمان بۆ وەخوێنێ
ئاتونی ئەم دۆژە فێدارە کوڵیی هەنسکەکانی
زەمەنێکە هاوەڵی پەڕو گمەو چپەو چریکەمە
خەنۆکیی هەنگاو بێهودەیە بەدوی کەروێشکە سرکەکانی بەختیاری
زنەی مەرقەسەکانی گومانیش کوێربوونەوە
پرسیارەکانی رۆحیان خۆڵن کرد
لەبەر بارانەکە هەڵدەهاتین لەخوسانی عیشق لەجوانیەکان
کە یەکەم ئوستادی بست بەبستی باڵاو  ماچە تەڕەکانی دڵی ساراو
هەناسەی خاك بوو
لەنواڵەکان عێجز دەبوین
کەتەریقەتداری باڵییەکانی شەونم بوون
هەنارەکانی تەمەن هەڵرێژین‌و دەنکە کرمێبووەکان بوەرێنین
دەرختە قسەکەرەکانیش دەڵێن چی؟
ئەوەتا زەوییەك لەگەڵا
گاز لەسێوەکانی باخی برین بگرین
ئەم هەسارەیە گەنیوە
سیپانەکان بەرامەی عوزلەتیان لێدێ
تا تخوبی سیراتی مۆزی مەحەك مەحف نەبێ
تا بەولاتی مۆزدا گوزەر نەکەین
لەکەماڵی جوانی لەپەیڤەکانی خۆڵ ناگەین
لەسەر شێتی ئاوو لەسەلاری گڕ ناگەین





کوکوختیەکان کۆچێکی درێژیان لەبەرە
لەقاتیی لیمۆ بێدارەکان
-با- لەژێر چەترێکی خۆرئاواییا پەلی ئاوی گرت‌و
بەم ناوە نامۆییان نواند
ئەم ناوە چ هیشکاییێکە؟!
ئێرە مەملەکەتی خۆڵەمێش‌و تەنافی نیگاکانە
مەقبەرەی چڵە زەیتون‌و کڵۆبەفرە
گوێ لەبێدەنگیدا دەتاسێ
هەی داد
لەچاوەڕوانیی قەتاری وهمەکان باری خورافە
لەئینتزاری دایکە رووح سپیەکان  بەگشت جانتا لەشان‌و
تۆزاوییەك  رادەچڵەکێن
لەوەستانی پەپوولەکان بەدیار لەرەی گوڵە چۆڕاوەکانی دوای
شەڕ
شەڕ
شەڕ
تەرمێ    بەرێ    دەکرێ

ئێی سارا متمانەی پرسەیەکت پێڕەوا نەدین، ئەوەتا مەرگمان بەسەر لەپەکانی -با-وە

**عەبدولقەهاری شێخ**

# رۆژژمێرە قەدەرییەکانی ســــەفـــەر

(لەرۆینیا ئەمێستا جێمانی تابووتە سێبەرییەکانی سارا پڕن لەتەرمی لم ئەو جەستەم ون : گەر لەوێی مەرگەوە ئێرەی بوونم پێ بپەیڤێ رووح)

زنەکان لێویان قڵەشاو قاچیان وەری و نابینا بوون
هێندە بۆ مەرگی هەورە نەزۆکەکان بگرین
سەمای زیخە وردەکان وەستاو سیحری لەرزینیان پووچ بوو
هاناو نزای سەرە مێکوتەکان لەکلاو رۆژنەی هەناسەکان بێهودە بوو
خاك لەپرسەی مەرگی باران سینەی شەق کرد
چیدی پۆستەی دوعای پیرەکان (با) نەیبردە ئاسمانەکان





هەنیە بەر نەفرەتی سەما کەوت
ئەسەف بۆ مەرگی زەرنەقوتەو
سەفەری پیران و
کەرتبوونی رووح ئەسەف
هێی یارۆ خۆت مەسوە لەهەناسە قووڵەکانم
گولاوی برینانم دەڕوشێن
سڵبە لەم دەڤەرە بێ ئامانەو شەوەکانی لوورەی گورگ
من لەزمان و سیحری عیشقی بەرد دەگەم
لەهەڵسانیا هیچ
من لەجەدەل و ناڵەی خۆڵ حاڵیم
بەدەم بێژەنگی باوە هیچ
ئەم رووبارە لێلانە ماچەکانیان لێخن کردین
درێغا بۆ مناڵی و حەزە چاو پەمەییەکان و نیگا بەریئەکان درێغا
ئای هاورێ گرینۆکەکەم
دەنووکمان هەڵوەری لەکێشانی قورەشینەو ئاوی مەدینەو هێلانەیان نغرۆ کردین
نزا پەرەسێلکەییەکانیشمان گیرا نەبوو
چەند پیرۆزە ئاگر ئەو دەمانەی ساردو سەلامەت دەبێو رووحە نەزیهەکان نابنە رەژوو
چەند رقم لەرووبارە درۆزنەکانە ئەو کاتانەی رێگە نادەن
هەناسە مێروولەییەکان بەتەڵە پووشێك بێنە لێوار

موقەددەسن ئەو رۆخانەی گەردی دەریاکان دەمژن

ئەهریمەنە ئەو ئۆقیانووسە بەرمۆدایانەی سەفەرەکانی عەدەممان پێ

دەکەن

نیگا خۆڵەمێشییەکان بەپفێکی چاوەنوارِی لەکۆچیدا

حەزە رۆمانسییە شەرقییەکانمان لەگەڵ پێکە قووڵەکان و سووتوە

کەڵەکەبووەکان

بەدەم سەمای دووکەڵی جگەرەکانەوە ئۆغریان کرد

تەپ و تۆزی گوناهەکانمان نەتەکاند تا بەجەستەمانەوە مەیین

فانۆسەکان رەش داگەرِان و کپ بوون

کۆ زامێکی دەرۆزەکەری ماڵی مێژووین ساکولبەیێ

دێر زەمانە سەفەرە بازنەییەکان یاوەری کۆترە باریکەکانە

بۆیە ئەمرۆ لەدوێنێو سبەینێی بولێڵم لەمرۆم مارە کرد

ئەمە گرێدانی کەزیەی زەمەنە

یا هەر سێوە نەفرەت بووەکەی ئادەم؟!

ئەمە قەدەری رۆژەکانی ئێرەیە!

تۆش لەمەنفایەکی بێ عیشق ئامێرێکی و گۆدۆیانە چاوەرِوانی

سەمایەکی

منیش لەدەڤەری خەونە بڵندە تەمەن کورتەکان

بێهودانە ئینتزاری مەملەکەتی تراوێلکەی فیردەوسەکانم

(فۆبیا)ی موعجیزەی ئایەتو ترازان لەمەدارەکان

شەوەی هەناسەی مەلۆتکەی ساتەکانمانە





سا بفەرموو گوڵە دالیا ژەنگاوییەکان

ها بەرۆکم گوڵە نایلۆنەکانت

هانا

دەستێ

وای

ئەم تخوبانە کاڵ نابنەوەو ئیدی سورمەکان نایەنەوە ئامێزی چیا

چ ساویلکانە ملمان دایە دەستی درۆی رێگا تەم و مژاوییەکانو

چ گەوجانە لەرژدی دەوەنەکان نەگەیشتین

خلافاین بەدەم چیرۆکە درێژەکانی داپیرەوەو خەومان لێکەوت

خەونەکانمان پرِ بوون لەسەفەری پێیە ئاسنینەکانو شەقاوی درێژو

خەمی کەڵەگەت. .ولێ

دوای رووبارە سەد رِەنگەکان ئاوی حەیاتمان ماچ نەکرد

نەبوینە کۆمەڵێ پرسیارو نەگۆی مەمکی وەلامێکمان کرۆشت !

قۆشمەی سپێدەی پێکەنینی گوڵ بەشالووری حەسحەسی ژانەکان

بزەو تەوسی مۆنالیزیا بەرووحە سپییەکەی داڤینشی

فەنەرە تینووە ئەوك وشکەکانیش رازەکانیان نەدرکاند

روانینە کرماوییەکان ئاسۆیان رام نەکرد

کلاوە (سیخوریجین)ەکانیش نەمانیان شاردەوە

بۆیە لەسارا غوربەتییەکانداقبیلەنوماکان وەك ئەستێرە کاروان

کوژەکان ونیان کردین

ئاوسیی شەوە یەڵداکان بوو لەکەسەرەکانی رووح

لەزەماوەندی زایمانیا:

تەزین

نزا

برین

سەفەر

گلان

رامان

کەرتبوون

قەدەر

قەدر

*حوزەیرانی ١٩٩٧*







# شەوێك ژنێك بەرووتی قسەی رووتی بۆ دەکردم

**هەناسەیەك بۆ قوبادی جەلی زادە**

شەوێ
کەلەشەوانی تر نەدەچوو
ژنێك
بەنێو هێڵێکی باریکدا هاتەلام
بەنێو تێلێکی شێداردا گەیشتینە یەك
شەوێ وەکوو هاوین رووت بوینەوە
وەکوو پایز بێشەرمانە سیپاڵەکانمان داماڵی

شەوێ
جگە لەقسەی رووت‌و چپەی  رووت‌و
ورتەی رووت‌و پەیڤی رووت
هیچمان نەگوت
نەرم نەرم قەیتانی پێڵاوە تەنگەکانی غەریزەمان شل دەکرد
دوگمە دوگمە قۆپچەی قەمیسەکانی لەززەتمان دەکردەوە
هێور هێور پەتووی سەر ژێیە حەسرەتبارەکانی رۆحمان
هەڵدایەوە
ورد ورد تاسەر ئێسقان رووت بووینەوە
شەوێ پیاوێک  بەدیار ژنێکی سووتاوەوە
شەو چەرەی پرووشکە تاریکیی دەجوو
شەوی ژنێک بەدیار پیاوێکی فێدارەوە
مژی لەدووکەڵی سپێدە دەدا
توێکڵ توێکڵ
لیمۆی جەستەی دادەماڵی
قاژ قاژ
وردە سۆزم لەت دەکرد
پەلک پەلک
خۆمان پاک دەکردوو
گەلاٚ گەلاٚ
بەسەر جەستەماندا دەکەوتین
شەوی  تەڕ تەڕ وەک دوو زرکە کاڵەکی خاکێکی بەراو





تاسنووری خوسان ئاو لەجەستەمان دەچۆڕا
شەوێ . . جگە لەقسەی رووت‌و
چپەی رووت‌و . . ورتەی رووت
چمان نەگۆت
گوتم ئەمشەو ئاوڕشێنێکی شوستەباریکەکانی رۆحم بکە
گوتی ببە پاشای عەرشی قەلاٚ موچوڕکە بەخشەکانم
بمگەیەنە دوورگەکانی
ئۆرگازمی بەختەوەری
ئۆرگازمی تیاچوون
ئۆرگازمی لەززەت
وەختێ سپێدە درزێکی خستەماڵ‌و سەرێکی کێشا بەشەودا
تەریق تەریق بووینەوە
شەوێ لەگەڵ ژنێکی رووتدا
بەرووتی قسەی رووتمان دەکرد
جگە لەچپەی رووت‌و ورتەی رووت‌و
پەیڤی رووت‌و هەناسەی رووت
چمان نەگۆت



# ســـــــایـه

سیگاردی سەفەر مەخەرە سەر گەردنی توێ توێی ئەم وێستگەیە...

هانا

رۆحت لەبۆنی گێوژو نیگای گوڵە بەرۆژەو هەناسەی بەفر خاڵی مەکەو

خۆت مەدە دەس سەوڵەکانی ئەم کەشتێوانە غەوارەیە

دەزانم تا چاو برکات نزای دووگوردو نێڵەی هەناسەی پاسارییەکانو

کەفو کوڵی خوشکەکانمانە

دەزانم تاتوانیت نەزیفی حەسرەت بووی

لەسەر تەنافی نێوماڵەکان پاکیزەییت دەگوشرا تاچك بووی

تێدەگەم برژۆڵەکانت بەسەر روانینەکاندا هەڵوەرین

روانینێك وەك گغەی ساواکانو ورێنەی پیرەکان لێی نەگەیشتین





هەرچی بەرامەی بارانیش بوو هەڵما

دوێنێ لەپاشەرۆکی زەمەندا بەدەم گریانێکی نەشازەوە لەدایك بووی

بەچنگی مامانی زیندەگی دەتزریکاند

زەمەن بەمەقەستی قەدەر ناوکی هیواتی بڕی

هەر گەڵا زەردەکانی عومر بوو عەورەتتیان پۆشی

هەر دەستە زبرەکانی بوون بوو گوانی خۆشنوودیتیان دۆشی

لەبەرگی لیمۆیەکدا پاکیان کردی و موچورکێك وەلەشیاندا نەهات

سێوە لاسورەی خەونەکانت لەگۆناتا کاڵ بوونەوە

وەلێ مەردی خوابەو پەژیوانبە

من بەتەنێ لەم دۆڵە خوساوەدا فتیلەی کامەرانیم پێ هەڵناکرێ

من بەتەنێ لەم شۆستە دڵشکاوەدا نیگا چەتونەکانی کوڕانم بۆ

ناژمێردرێ

ئەو کوڕانەی تامردن دەبنە کێلێك سەهۆڵی تەماشا

سەفەر وەك ساڵێکی تووشو تەزیو

گوێسە بانەی خەونەکانی کردە چلوورە

هەرچی ئاونگی سەر قەفی هەنگاومانە بەستویەتی

هەرچی چۆلەکەی سەرئالیەرەکانی روحمانە رچیون

سۆندە درێژەکانی حەوشەی جووڵەشمان رەق رەق بوونە

سەفەر چۆتە نێو خوێنو دەمارو ئێسکەکانەوە

ئێمە ئالوودەی سەفەرین یان سەفەر بەقوولایی

بیرەکانی تیاچوون قوتی داوین؟

هاوار بەماڵم من بەتەنێ بەرگەی ئەم مۆسیقا خەمناکە ناگرم
باوشێک تەزینم بۆ کوشێکی گەرم پێنابرێ
مەردی خوابە خەونم دیوەو پەژیوانبە
دەتەوێ سەرقاڵی دۆزینەوەی خەونەکانی مناڵی بی؟
کەبەر لەوەی کەڵەشێری بەرەبەیان بخوێنێ وەخەبەریان هێنان
دەتەوێ بەدووی وێنەی ئەو سوارەدا بگەڕێی؟
نەنکت شەوێکی زستان بەدرۆ بۆی گێڕایتەوە هەتا بنوی
ئەو سوارەی لەقووللەی قافیشدا نایبینی!
ناحەقت ناگرم کەوەبزانی (خاڵخاڵۆکە)
ماڵی خاڵی خۆشنوودیت نیشان ئەدا (کەنایبینی)
سەیر نییە بەتەمای فریشتەی هانا خەوبتباتەوە
کەبێجگە لەخەوێکی قووڵ چیتر نییە
بێهودەیە سەرگەرمی چنینەوەی ڕێگاکانی ویساڵ بی
ئەو ڕێیانە قاچی ڕێبوارێکیان نەگرتە خۆ
وای ئێمە چ دەبەنگێکی ئەم جادە قیرتاوە بووین
کەئومێدەکانی بەدەم باگردێنەکانەوە پەسترانەوە
ئای ئێمە چ سوارێکی نابەڵەدی ئەم ڕچەیە بووین
کەبێجگە لەسمدان و نوچدان ئاوەدانییەکمان نەبینی
مەردی خوابە خەونم دیوەو پەژیوانبە

٢٠٠٢





شاعیر لەم دەقەدا بەزمانێکی ڕۆمانسی ناسک دەدوێ، دەقەکەش تەژییە لەوێنەی جۆرا جۆر کەلەکاتی خوێندنەوەدا تابلۆکان هەر هەموویان وەک بەفرچە کێشرا بن گەماڕۆی چاوی خوێنەر دەدەن.

**شێرکۆ محەمەد**

## پژمین

(من بەسیروانبوونی مەراقەکانی غوربەت تاوانێک بوو لەئاوڕە
تینووەکانی ساراو چاوە هیشکەکانی)
ئەمە بیمە یان شەکەتیی فەنەرە مانووەکانە
نوچانێک دەدەن؟
ئەمە تەرمی عیشقەدەنێژرێ و سەمفۆنیای سەفەری عەدەم
یا ڕوت بونەوەی ڕۆحەکان و نەزاهەتە
شەنگترین بالیەو چۆپییە؟
ئەمە دوا جەدەلی هەناسەی شالوورو هەڵکشانی
جەستەو ڕۆحی شەونمە

یان لەدایک بوونو بەرزە فڕی و لرفەیە؟!

پاسارییەکان بەقدەری ڕۆژژمێرە شرەکەدا خۆیان هەڵواسی

مانگو ڕۆژو جریوە هەڵوەرین

ئەمێستا بیٚ ڕۆژو مانگو جریوەین

مەدەد

ئاه

چڵک و خۆڵەمێش ئەزەلیەتی جەستەو ناخ بوو

ڕۆح لەلینجی فیردەوسەکانا خلیسکا

بۆیە نەبوین بەباڵندە

لم حیکایەتخوانی شەپۆلە سەرابییەکان

داتەپینی خشتەکانو ترازانی جومگەکانە

کاکۆڵی چیاکان بەکرێوەیەک خۆیان نەشۆری

تائاقارو بنچکەکان شایی بەرائەت بەبەستن

بەهەشتە تارا پۆشەکان تاوانیان لەهەناودا شاردەوە

بڵێی یاساکانی ئێرە بووردوو تربن؟

هاوکێشەیەکی ئاڵۆزەو ماجەلانی چاخێکی نوێین

بەدەوری رەشماڵە رزیوەکەدا دەخولێینەوە

ژانی کچە کرماوییەکان لەوردە خەوێکی هەڵبزڕکاوو

گەرمە ئاهێکدا خارشتی نەمرد

قەدەر! سک ئاوساوی رازەکانی سبە

قەدەر! تەختەی (محفوظ)ی من و عیشق و کارەسات





لەپەڵتی فنجانو لۆچ و درزی لەپماندا

دۆش دامانو مێژوومان کوشت

کەنعانی چ سارایەکو فرێزەری کام مەوسیمە

سرووشو تیشک پەی پێنابەن

— — — —

سیپاڵەکانم لەهوروژمی گەلا کوتکەکانی داپیرەمدا پاکژنەبوون

لەهەڵزنانما وەباڵای پەیکی (با) رازەکانم پەرش بوون

هەناسکە برکێی خۆمو هانکە هانکی سەگەکەم

وای ئەشکەوتێک سەدەیەک نوستنم دەویٚ

سەفەر دەکەم

چیدی لەسەر رەگی ئاوساوو هەڵتۆقیوی

کەنیشکە سپڵەکان ماچەکانم نادۆڕێنم

گۆی مەمکێکی تر دەمژم

هەنیەم دەدەمە بەر نەفرەتی یاسا کەچڵاوەکانو

فاڵچیان دەکوژم

بمبەخشە قەرە جێکم زەمەن لەهەنگاوەکانم ڕام دەکەم

تا بازنەکان قەناری گەروم سەر نەبڕن

خۆم بەچلوورەی هەورێکدا هەڵدەواسمو

ڕۆحم لەبروسکەیەکدا دەتوێنمەوەو دەبمە کلاو

لەقاتیی بارانو بووکە بەبارانەدا

ئۆخژن دەخزێنمە هەناوی منالانو چاوی عەیاران دەرێژم

لێلما وەرە

نیگا مۆمیا کراوەکانت بشۆرەوەو سەرنجی گرێدانی توولەڕێیان کە

کەخۆری روح شەلاڵی خوێن کرا

دڵنیا لەخولانەوەیەکی دی سەر دەرناخاو

زەمین خڕی خۆی لەدەس دا

دەسا وەرە شەوە یەڵداکان لەخەو ڕابێنە

سیحری داخراوی نوشتەکان بەڕەلاکە

ئەمە دەڤەرێکی یۆتۆپیاو تراوێلکەی خەونە دوورەکان نییە

موستەحیلەکانیش درۆن تالەپرسەی ئۆغری

مەسیحدا دابمێنین

یاخیبە، تا پەنگرەکان رووت دەبنەوەو

توێژو توێکڵ دادەماڵن

بزەو تەوسی گەلا لەهزری گەمژە بووی زەمەن ئاڵ کەین

شەونمەکان لەگەڵ بەیانێکی تردا پاکیزەیی

بچۆڕێننە سەر عەرشی لێخن

یاخیبە، بابەرامەی نێرگزەکان هەڵمژین

تاپرتەو پەتای ئەم قوتیلکە بەسالاّ چووانە

ئەوکی گوڵان رەش نەکاتو

چیدی ئێمەش نەپژمین

نەپژمین

نەپژمین!!





١٩٩٧



## دەفرێك لەهیشك

لەنێو تەمی دوکەڵی جگەرەکەمو تاریکایی ژوورەکەمدا

سەراپا لێو بووی عوزلەتو دابڕانێك ئەوکی گرتووم

گریانێ گەمارۆی داوم

کوڵ هەنسکێ دەمخواتەوە

درزی هزرێکی پەرت بوو هێور هێور لەگەڵ نەرمە- با- یەکی تەزیو

بۆکۆلانەکانی یاری و کوچە عەجوولەکانی پاکی دەمباتەوە

ئەمشەو لەبەژنی تۆقیوو لەرزیوی کچێکی هەڵبزڕکاو دەچێ

لەپەردەدا، هێشتا زاوای بەختی نەبینیوە

لەلرفەو هاژەو زریکەی چەم

لەژانی درەختێك كەنازانم تیتكی بۆكێ دارڕنیوە

ئەمشەو قامیشەلانێكی كپم

دێر زەمانە دوا گۆرانیم بەدەم نەرمە بای شێتەوە

بۆ كۆس‌و قۆچم چرپیوە

رۆژگارێكە سەراسیمەی كەوشەنێكی پڕ ترازانم

زێدێكم لەجودایی

دەفرێكم لەهیشكایی

ئاخێكم لەفیراق

رێدەكەین‌و گلۆلەی ئاڵۆزكاوو گرێ كوێرەی ئەم فیراقە ناكرێتەوە

هەرئەڕۆین‌و كۆلارەكان غەریبتر

لەنهێنی ئەم بوخچەیەو حیكمەتی ئەم نوشتەیە حاڵی نابین

قەدەرێكەو لەهەنیەمان نابێـتەوە

ساتێ لەكولێرەی سەبەتەكانی ژوانێكمان نەجوو

ئاهێكمان  لەئامێزی یەكتریدا هەڵنەكێشا

خەمێكمان لەكۆشی یەكدا نەكوشت

خەونێ بوو رۆی ئەستێرەیێ بوو زووكشا

مناڵیمان سپاردەتەنهایی و  مەینەتی و كەسەر

لەیستۆكەكانمان لەسەر لمی گوێی رووبارێكدا بەجێهێشت

جۆلانەكانمان بێكەس بوون

ئەوێ  دەمێ بەیەكەوە بەژن‌و باڵامان دەكرد گەورە دەبووین

شتێ بوو وەك — با-  وەك بۆشایی





نەرام بوون‌و نەهاتنەوە

واچوون. . . چوون

مناڵیمان سپاردە دەریا

سپاردە نەهەنگە برسییەكان‌و شەپۆلی تیژڕۆ

سەیر بوو مناڵیمان

لێو بوو لەیاداشی سەیر

پڕ بوو  لە چوكلێت‌و بیرەوەری

شتێ بوو وەك فڕندەیەكی كۆچەری كەوی نەكرا

تاوێ نیشت‌و بۆ هەتا هەتایی فڕی

راكەڕاك‌و چاوشاركێمان لەگۆڕستانی مەنفادا ناشت

پێنج شەمموانیش بێهوودەیە ئاهێكی لەتەك  هەڵڕێژین

كچێكی تازە هەڵچوو بوو

وەك تارمایی

وەك فریشتە

بەگومانم چۆن دەركەوت‌و چزوو وا چوو

مناڵیمان تامێ بوو جیا

تامی جەژن

لەزەتی پێلاو كڕینێ

ئۆخژنی ئافەرینێ

تەزو و چێژی  شەرە بەفرێ

خەونی ژێر ساباتی كەپرێ



# قەیرانی ماچ و تەرمی چپەکان

شەپۆلەکان تورە هاتن
هەتاو جێ ماچەکانی سڕینەوە
هاتن بەری زێرابەکان بەردەن پەنگانەوە
رۆخو لێوارەکان نوقمی تاوانەکانی مێژوو بوون
درزە گەورە دەنگ نوساوەکان تینوو بوون هەڵوەرین
لەگەڵ ئەستێرەی کاروان کوژەدا رێکەوتن
چرای سروودێکی نەشازیان هەڵگرتبوو





قەسیدەی شاعیرێکی نامۆو ناخو رەشیان بۆ دەسوتا
توند بون
هاتن چکەی دڵۆپەی پیرۆزی بوەستێنن
قشتیلە بێنازەکان لەگڤەی(با)و جیرەی دەرگا
رانەچڵەکێن
تیتکی شۆخە کچی سیما پاییزی
لەرەحمەتی داسی دروێنە دەربێنن
هاتن
هاتن
هەنگاوەکان ڕەشاییان لێدەچۆڕا
سێبەرەکان دەبون بەخێو
شەپۆلەکان لەگەڵ سەمای تاڵەتیشکێکدا دەمردن
هەور ژانی نەدەکردوو هەور نەزا
کەڵەپۆلوی حەسرەتەکان بەجەستەو رۆحمانا دەچزا
لەچاڵی سفرا دانیشتین
هەنگاوێکمان لەبار چوو
دووان و سیان و چوار
سەردەمی لەبار چوونی هەنگاوە
چاخی نەزۆك بوونی هەورە
هەرەسی ئابڕووە
تەپینی سابیتەی سترە

بەخۆدا نەچوینەوە
لەسەرەنوێلکەکاندا قوقەمان خنکان
ئێسکە ڕزیوەکانی (حاجی) مان دایە دەم(با)و
جنێوە چوکلێتەکانی (شێخ) مان سوتان
لامان وابوو
بەچەپکە گزنگی چاوی ئێوە
نیگا مەیوەکانی فەیلەسوفەکان لەفرێزەری عەقڵی ئێمە
دەتوێتەوە
پێمان وابوو گرێ کوێرەکان دەکەنەوەو حەقیقەتەکان دەنوسنەوە
بازاڕەکان لەبۆی ماچە گەنیوەکان پەپوولەی تیاگوزەر ناکات
شەقامەکان بێ پیاسەی ئێوارانی هەنگەکانە
بەژنێ زراف تۆراوی سەر شۆستەکانە
کۆڵانەکان رەشبەڵەکی تکانی حەیای شار دەگێڕن
کوێوە بچین
دەستێ ئارام وەقژی گڤنی خەمەکاندابێنێ
مەگەر لەگۆڕستانەکان کەمێک هەناسەی فێنک هەڵمژین
مەگەر لەگەڵ سەگە بێ کوخ و لانەکان نیوە شەوان
ساتێک بێ کەسەر بژین
تەنها لەئاودەسخانەکانا خەیاڵێک شک دەبەین
دێوە جامەی سەر کەناریەکان هەڵدەماڵێ
کوێوە بچین کوێ کوێ؟!





لەوەتەی هەین بەدووی سەرابەکانا لەغاردایین
لەبۆسەی تارمایەکاندا دزەمانە
لەکەنعانێکدا نوقمیان کردین سرووشی تیادەخنکێ
کەی دێ وادەی تاشینی زەلی ریشی پڕ کێچ و کرێشتانە
بۆ لەزمانی عیشق ناگەن
بۆ لەئێوارە شیعرەکان خۆ دەدزنەوە
واپیرۆزیی گیانی سێوێ لەسەگی شەهوەتی ئاغاکان هەڵدەوەرێ
مەمکە شەرمنەکانی(شیرین) لەژێر شفرەوکەڵبەی
(گەڕا) لەرزەیەتی
کوێوە بچین کوێ کوێ؟!
ئەمشەو بەدیار دڵۆپەی تکاوی پیرۆزی
پەپوولەکان گەرمە شینێکیان دەگێڕا
ئەمشەو وەدووی (عەنقا)ی ویژدان
لەفەزای رەش داگەڕاودا بەتاسەوە چاومان گێڕا
ئەمشەو ئەمشەو
هۆ کەژێ گیان تۆش بمبورە
رۆژگاری نغرۆ بوونی بەڵێنەکانی کولێرەی گەرم و شەوگاری سوورە
هۆ کەژێ گیان تۆش بمبورە
لەم شەوە تاریک و لێڵ و پڕ تاسەیە
ماڵ ئاوایی دوا تروسکەو هەناسەیە
هۆ کەژێ گیان وادەی سەفەرەو دوور دەڕۆم دوور

**بۆ گەڕانەوەی سبەینێ دەس لەئەژنۆ مەنوارە**

**لەم جەنگەڵ و خەراباتە کێ بەیانی لێوە دیارە**

**دەماڵ ئاوا**

**گوڵی ئەمەل و لەتە سێوی ولاّتی دڵ**

**دە ماڵئاوا**

**هەناسە بۆگەنەکان رۆحە مۆمیاکراوەکان**

**دەماڵ ئاوا کەژێ خاتوون**

**پژمە ئەبەدیەکانی دەڤەری برین**

**ماڵ ئاوا**

***١٩٩٤ چەمچەماڵ***







# پێناسی شتەکان

**ترێ: حیکمەتی دۆزینەوەی**

**هێشوە قونبولە بوویت**

**بەبەرچنە کردیانە دیاری**

**سێو: جوانیەکانتمان کردە خەلاّتی هەڵەبجە**

**زارۆکانمان پێ فریودا**

**بەفر: سوودمان لەئەزموونەکانت وەرنەگرت**

**تالەعیشقی یەکتردا ئاوێتە بین**

**باران: نەتمان ناسی**

**تادرووێنەی خەمان کەین**

ئاو: بەرائەتمان نەخوێندەوە
هەنیەمان گوناهی لێدەچۆڕێ
هاکا سەرەو ژێر وەرگەڕاین
بەرد: تەمەنێکمان بەهەدەردا
نەوانەی سەنگینیمان خوێندو
چ لەسەبریش نەگەیشتین
زەوی: لەبری گوڵ
لە(مین) یان هەڵکێشا
بفەرموو وڵاتێکی بێ (پێ)
مانگ: شۆستەکانت زیوین کرد . . کەچی
ئێمەش بەرەو زێرابان کشاین
ئینجانە: گشتمان وردو خاشکرد
مەگەر لەقەوانەکانا
گوڵ بچێنین
شەو: ساتە چێژ بەخش‌و لەزەتاویەکانی
بەخیانەت کردمانەوە
(کبریتی فورسەت) مان پێنەکرد
تیشک لەهەناودا خامۆش بوو
هیس داپیۆشین
هاکا سەرەو ژێر وەرگەڕاین







## رۆشــنایی

لێرەوە بانیگایەک بەسەر جریوەی
ئەو پەڕەسێلکانەدا بخشێنین . . ساڵی پار
لەنێو تۆڕی راوچییەکدا بەیادگاری جێیان
هێشتبوون دەیانگوت:
(عیشق لەگەڵ وەرزەکاندا بەسەردەچێ)
لەهاوینێکی ئارەقاویدا لەپی —با—
بەسەر قامک‌و گوێیەکاندا بێنین
تائۆخژنێک بچۆڕێتە سەر ژێیە حەسرە تبارەکانی
رۆح ... ئەی

سایەیەک دەکەینە چەتری ئیرادەی روانین.. تا
کونجێک لەرۆشنایی چێبکەین
شۆستەیەک لەدڵنیایی
دیوارێک بەعاتیفە سواخ بدەین
دەبینە دێوەرەیەک
لەگەڵ سەمای گەلاکانی زەردە پەڕ
لەگەڵ رژانی ئەستێرەکان
لەگەڵ شەوی  کاکۆڵ زێڕین هاوار دەکەین
رۆشنایی
رۆشنایی
منالآن بەبۆنی رۆشن بەخەبەر دێن
قەیرەکچان خەونی رۆشن دەبینن
پیرەکان ردێنیان رۆشن دەچێتەوە
نابینایان رۆشن دەبنەوە
شەوە دەیجورەکان روون روون
رۆشن دەنوێنن
رۆشنایی
رۆشنایی
رۆشنایی





* لەهەندێک شوێندا بۆنی هەناسەکانی سوهرابی لێدێ.



## حاڵی عیشق

دەروێشێکی فەنابووم و
حاڵ دەمگرێ و رووح هەڵماوە
لەگەڵ ناڵەو نزای دەفا
پاسارییەکی بێئوقرەم
خۆڵەمێشم بەدەم-با-وە
مەسیحێکم نانیشمەوە
هەڵکێشراوم لەسەد لاوە
- - -

کۆڕی عیشق گەلێ تێیچوو
زۆری دۆڕا
بەموریدی نەمانەوەو دەیان پیران تێیدا گۆڕا
وەلێ سارا  لەئامێزی پڕ عیشقی من
سەوزی پۆشی و شیلەی ماچی لێدەچۆڕا
ئەوین گرێ بێئامانەو
دەیان سەنعان  لێی وەرگەڕا

- - -

شەوان لەهاوارو حاڵدام
بەڕۆژ ڕێگاکان تەی دەکەم
فەنام. . فەنا
بەدووی مرواری و مەرجانا سانایە لام
مەلە لەدەریای بێ بنا
خەیاڵ  بەرزو سەرم گەرم بوراقێکم لەفڕینا
مەلەوانێکی بەڵەدم لەدەریای عیشقو ئەوینا

- - -

تنۆک تنۆک لەگەڵ باران دێمە خوارێ
چاوی سارا  پاراو  دەبێو
گەردی سەرگوڵان دەتارێ
سۆزو عیشق  دەبەشمەوە
بەسەر کووچەو گوندو شارێ





ئاوایە عیشقو گەورەبوون. . ئاوایەوا
کەشتی رووح ئۆقرە نەگرێ
لەهیچ رۆخو هیچ کەنارێ

- - -

لەقوولایی دەریاوە لێم بڕوانە
بەپاکیی دەنکە زیخێکم بسپێرە
نیوە شەوان وەرە ژووانم
لەگەڵ هەڵاتنی ئەستێرە



# شـــانۆ

**پەردەی یەکەم**

**شوێن**

**زێدێکی لەت. . گەردنێ م**

**چەقۆیەکی ژەنگن**

**کات**

**مەغریبێکی تەماوی چڕ ( لەو ڕۆژە دەچێ کەس دادی کەس نادات)**

**مەغریبێکی تەزیوی چڵکن**

**کەسەکان**

**سمێڵ بابڕەکانی دیرۆك. . . گروپێ یاساوڵی**

**چاوبز. . . من**

**ڕووداو**





**ترس سەراپای داگرتوون (لەبیمی ئەوکچە دەچێ لەکەوتنە خوارەوەی پشتی کەرەکەدا، تنۆکێ خوێنی لەبەینی رانەکانیدا دی). کەنیشکێکی لادێیی شەرمن**

**کۆتایی**

**ئاشێکی ئاو لێبڕاو، مینبەرەکان دوا ئایەتی سورەتی ئەنفالیان دەخوێند، گوندێکی دوای ناپاڵم (لەسیمای ژوورێکی دوای شەهوەت ڕشتن دەچێ)!**

**پەردەی دووەم**

**شوێن**

**لەتە خاکێکی خوڵەمێشی**

**کات**

**عەسرێکی خوێناوی لەکوشتنی حوسێن دەچێ . .**

**زریکەی بەرد. . قیژەی زارۆ (ئا ه چ کاتێك)**

**کەسەکان**

**من و من**

**ڕووداو**

**عەزیایەکی حەوسەرە، سەرچاوەی کارێزەی گرتووەو هەرژەمە ناسکە گۆشتی لاوێکی دەوێ. . کۆمەڵێ ئێسکی کەڵەکچن**

**کۆتایی**

**بێستانێکی خۆرە بردوو. زەبەلاحێکی سەیری**

ورگن. . هیچو هیچ

منو من



## تابوتی عیشق
## لەدایەلۆگێکدا

کات: یەکێ لەشەوە ساردەکانی زستانە، پاش چەند ساتێکی تر چرکەکان لەگەڵ ساڵی نوێدا ئاوێزان دەبن، گەنجێکی تەمەن بیستو سێ ساڵەی باڵا بەرزی جوان لەیەکێ لەژوورەکانی ئوتێلێکی ئەو شارەی کەسێ چوار ساڵە لەئامێزی گرتووە، تەلەفۆنەکەی گرتووە بەگوێیەوەو بەلێوەلەرە قسە ئەکاو لەتابلۆ گەورەکەی بەرامبەریشی راماوە: کە گەنجێکە لەشکڵی خۆی تا ناو قەدی لەتابوتێکەوە دەرهێناوەو هەردوو دەستی بەرەو مانگێ بەرزکردۆتەوە، بەخەتێکی سووریش لەژێری ڕا نوسراوە(تابوتی عیشق).

-ئەلو کێیە؟





+ ڕێ برەکەی شاخو دەشتە،

تامەزرۆکەی گوڵی رووتو،

خورشیدەکەی سورمەخانو. . .

فەرهادەکەی گیان لەمشتە. . .

- بەم ناوەختە- (پەتا)ی چیتە؟

وتم داخۆ چی رووی دابێ

چ شتێتێ بێ رووح کێشانی

لەئەستۆی ئەگریجەم نابێ؟

حاڵت چۆنە؟

+ لەئاسمانی نامۆییدا مەلە دەکەم

لەولای پەردەی حەوتەمینا

پەلەپڕوزەی مەرگو ژینمە

وام لەدەریای قەترانیدا

لەگەڵ سەدای ناڵەو شینا. .

-بنوو . . . بنوو ئارام بەوە

خەوتارمەکەلە چاوانت

قۆڵنگی فەرهاد فرێ دەو،

بەردە توولە رێی نەمانت

+ پێشتر وتم:

کوردی (قالە)م

(نالی) دەشتی شارەزوورم

بولبولە شەونخونەکەی گوڵی یارو،

(مامە عەبە) ی کوڵ لەپشتی

ڕێگەی دوورم. .

هەرگیز نانووم

- زۆر کەنەفتو بێ تاقەتم

چیت لێم دەوێ

ئەم داستانو چیرۆکانەت

بەم ناوەختە

کێ دەیبیسێو کێ دەیەوێ؟

+ دەنگی ناسکی شمشاڵ ئاسات عیسای مردوو زیندوکەرە

ئیمشەو (بتهۆڤن) خەریکی هەڵڕشتنی

نەغمەو سیمفۆنیاو هونەرە

باگوێم لێـت بێ . . گوێچکەکانم،

تینووی دەنگتن. . .

-وەکو وتم

مەرگ وا لەپیشوازیتا

هەندێک ئاسمان ڕێژنەی خەمی بۆ دەناردن

بوخچەی خەمی تۆ زۆر سووکە، زۆر بچووکە

شەش حەومەتری خامو چیتە. . بنوو . . بنوو

+ گرەوی مانو نەمانە

-شەوی ئازارو گیان دانە





+ من هەڵگری ئالای عیشقم

- بێگومانم تۆش یەکێکی هەر لەوانە

+ تۆفانی ئەم عەشقو گڕەم

نەک هەڵگوردێ

بالآی دەیان هەڵگورد دەگرێ

نابمە فەرهادقۆڵنگەکەم

زگی تاقە چیایەک بدڕێ. .

هەرچی چیاو لووتکەو شاخە

کڕنۆش دەبەن لەبەردەمما

خۆشم دەوێی:

سەد ئەوەندەش . . دڵی بەردت

لەئاهو نزام نەپرسێ

بێگومان بە ڕۆژێ دادێ

چی قەڵەمی دنیا هەیە

سەرگوزشتەی ئەم عەشقە پاکەم ئەنوسێ. . .

بۆبێدەنگیت ؟ ئەلو ئەلو

بۆ بێدەنگیت؟ ئەلو ئەلو

( لەو دەمەوەی کیژە تەلەفۆنەکە دادەخا لاوە بەردەوامە لەسەر قسەکردنی خۆی، کاتێ لەڕۆیشتنی کچەو خەت بڕینەکە تێدەگا فرمێسک بەچاوەکانیا دێتە خوارو گیانی دەکەوێتە لەرزەو تەلەفۆنەکەی لەدەست دەکەوێتە خوارەوە، ئیتر کارەباش دەبڕێو

مژدەی ساڵی نوێ دەدا!



## سەفەرێك
## لەخەون دەچێ

رەدووی عەنقایەك كەوتووم . . . بەخەونی
ماڵێ چێكەم لەژێر بۆشایی
سەفەرێك لەسەر بەرماڵەكەی دایكم
لەسەفەرەكانیتر نەچێ
تیشكاویی بم لەرۆیینا
دووربینێ بم لەژێر چوونو





دووربینێ بم لەبینینا
میلی كاژمێرەكەش بپسێ
دەمەوێ ژوانێ ببەستم لەگەڵ خۆڵا
بێ شەممەو هەینی بێ
شوێنێ نەبێ بۆ جێكەوتی قاچەكانم
خۆرێك نەبێ بۆ كاتو
كاتێكیش نەبێ بۆ لەززەت
هەراسانم هەراسانم هەراسان
مەحكوم بەكۆتایی هەنگاو بەبستێ عەرد
مەحكووم بەرۆژانی هەفتە. .
دەمەوێ لەگەڵ —با— دا
بەشوێن شوماری مەحاڵی مانگ بكەوین
ئاهـ كە چەندە هەراسانم
لەو موگناتیسە نەگریسەی خەونەكانی
پەڵكێش كردووم. . .



# غـــورروور

لەدارەکەی بەرو پشت ڕێ

بووین بەقوربانی قەدەرێکی لێڵ

دووهێڵی تەریبی نێو دوو دەڤەری جیا

وێستێ.. ئاورێ نەبوو

تاسەحەرەکان بەرامەی گولان

بپژێننە سەر شۆستەغەریبەکان

مالاوا

لەتۆنێلی مەراقەکان دا چەخماخەی بزەیەک

خولاسەی بەغەمە پیربووەکان دەدا.. چ غرورێک بوو لەیل

بوین بەفیدای





تەقسە مەئساویەکانی حوجرەکانی زیکر

ئەوحوجرانەی لێون لەئاهەکانی زیکر

ئەو حوجرانەی لێون لەئاهەکانی عیشق

مت بووی لەئاست نزای جریوە تەڕەکانم

کپ بووی لەدیدەنی بالێی هەناسەکانم

چ غرورێک بوو لەیل

ڕژامەنێو سالەکانی تەنهایی و بۆشاییەکانی نەبوون

سڕامەوە لەسەر هێڵە قاچاغەکانی ئەوین

خاکێکی زڕ دوا وێستگەی حەسانەوە

چ غروورێک بوو

بووین بەقوچی قوربانییەکی بێ جەژن!



## ژووانی نوور

دواین جارەو چیدی شێتان
بەم دەڤەرە لیکاوییەدا
رانابورن
چیدی ختوکەی فیردەوسە دۆزەخییەکان
پەژیوانی لەباڵی (با)
ناخوێننەوە
ئیدی ئاوڕ
ئاوڕ
لەم کەوشەنە (فێ) گرتووە
نادەنەوە





جێ دەهێڵن‌و لەدووی خۆدا
مشتێ خۆڵ‌و
دەفرێ رۆندکی عیشق‌و
بەرماڵێک جێ دەمێنێ
دواین جارەو دوا نوێژی
مەردومی مردوو
لەئاوابونێکدا دەبەستن
ئاوا دەبن
ئاوا
وای کارەساتە لەعاقڵ بوونەوەیان
چریسکەی یەقین لەچاوانیاندا
دەچریسکێ
گومان لەرووتبوونەوەیاندا
عەدەم بوو
سەفەری تیشکە نەزیهەکانە
لەمیوانداری نووردا
پەردەکان دەکشێن
سەفەری دەنگە بێ رەنگەکانە
بێ تەڕبوون‌و باسکەلێدان
دەریا رەنگاڵەییەکان دەبڕن
دەریای شین‌و دەریای کەسک‌و

پەمەیی
مەلەی شەکرو شیری دەریا
وای لەعاقڵیمان چ کارەساتە!
وەرەپێگڤە
بەسوێرەشکی عیشق غوسڵی ئەبەدییەت دەرکەین
تاعیشقن بین
سارایە گوڵم دەریاچەکان زوخاو دەدەن
تەنها مشتێ خۆڵ جێماوە تەیەمموم کەین
ئەوەش بەرماڵ
پاکژ بەوە پاکژ
نوێژی شێتی دابەستە





# کڕنۆشی فیردەوسەکان

بەهاوڕێی هونەرمەندم
(کامەران عەبدولڕەحمان) پێشکەشە

وەرە مشتێ تیشکی پاکی هەناسەکەت
رۆحی چڵکنمی پێبشۆ
هەڵەتەی ئەم ساکە دەشتەم
بۆنی خوێنو شەرم لێدێ
ساپرمکە لەتامو بۆ!
بۆخەرمانی خەمانی خەونانم
شنەی شەماڵێکم نایە
وەدادم بێ دەسا زووکە
جەستەم غەرقی عاتیفەکە. . دیسان دایە!
پرسیارەکان مێشکم دەخۆن
دەسەرنجێ دەنیگایێ
لەئامێزتا هەپروون دەبن

بوون‌و نەبوون

عیشق‌و مردن

وەلآمێکەو لەبڵێسەی دەروونتایە!

دەروێشی ڕێی ورد بوونەوەو تێڕامانم

تاوێ ئاسمان. . تاوێ زەمین

ساتێ سەمای گەلآی وەریوی ئێواران

سبەینێکان هێندە لێڵن

قەدەر هاوەڵ‌و هاوڕێمە

سەر دەر ناکەم هەر دێمەوە

چاوەکانت دوا مەسکەن‌و دوا نزرگەو دوایین جێمە!

هەڵمگرەو لەچاوانتا بالەسیحری باران بگەم

لەتیشکێکدا بمشۆرەوە

تاچڵکنی بوون فڕێدەم!

هەڵمگرەو تاتەلیسمی جۆگەلەکان بدۆزمەوە

بۆ ئاوڕێک بۆ سەرچاوە نادەنەوە؟

بمشارەوە. . هەتا دەستی چەقۆو تاوان

ڕۆحم نەبەن

مەدەد دایە. . ئەی مریەمی عیشق‌و گرین

خەم‌و برین

فیردەوسەکان لەژێر پێتا کڕنۆش دەبەن!

١٩٩٧







# فرمێسکێك دەمکاتە ڕەژوو

ئەستێلکی چاوت لێوە لەکەسەر

دڵت تژی لەشکان

نیگات حەسرەتی لێدەتکێ

دەروونت بۆتە کوانووی ئاگردان

لەسیمای ڕەنگ ڕەعفەرانی‌و

هالآوی هەناسەی پاییزیتا خەمێکی قووڵ

قووڵ وەك قووڵی خەونەکانت

بڵند وەك سنەوبەری ژانی هەڵچووت

روون وەک  کانیی گلێنەکانت
بەسوێ  وەک ئەوزامەی
بەدووی مەرهەمێکدا دەگەڕێ
لەئاوابوونێکی پاییزی دەچی
بەم بەهێی رووخسارەوە
هەنسکی لالەیەکی پڕ درزی
بەدەم  خەمی ئێوارەوە
قامەتی بالآی زرافت کەیلە بەدەم
رەحمەتی ئەم ئازارەوە
لەسەرکەڤاڵی سیمای تەماویتا
هۆن هۆن  ئەشکت دادەباران
چ ناخێکە وا هەڵدەچێ
چ کۆستێکە وا بەسوێو ژان؟
هێندە بەخور دەهاتنە خوار
مرواری ئەو فرمێسکانە
وامزانی پەڵە هەورێکی
لەچەخماخەو لەسووتانا
مەدەد  ئەی  تانجەڕۆی چاوان
چییە ئەم هاژەو لرفەیە؟
مەدەد ئەی خۆری سوتێنەر
چییە مانای ئەم قرچانو





گڕوگڕکانو گڵپەیە؟!
دەسا داباری بەسەرماو بەخۆردا کە
بێ جی و مەئواو چەترو کەپرم
تا لە پاڵ ئەشکێکی درشتتا
هێور هێور
منیش بمرم



## کاروانی مسك

لەنێو خەڵوەتی  ناسۆری عیشقا
لەسەر لێواری  پەنجەرەو تیشکا
لەنێو ژیلەمۆی چاوەڕوانییا
نیگای پڕ تاسەم لەبەیانییا
باوەشی خەیاڵ چاوی روانینم
دەگرمەئاسۆی ناسۆریی ژینم
سۆفی خەڵوەتی خانەقای خەمم
لوتکەی حەسرەتی لێو بووی لەتەمم
پەنجەی چناریّ بالاّ  تەزیوم
زریکەی چەمێ عیشقی رچیوم





هەردەی تەنهاییم نەحەسا کەمێ
نیگام قەتیس ما لەسوێی مەرهەمێ
قافڵەچی شاری عیشقو ئەوینم
چقڵ رێژ کرا فەرشی رۆیینم
پێڵوم لەشەوی تارا هەڵوەری
مەلی دڵ باڵی لێکداو رۆی فڕی
لەنێو ئاپۆرەی حەزو تاسەما
پشکۆی داخ دەچزێ بەهەناسەما
شەوی ئۆخەیم لەگەڵ  کاروانا
غەریب داگەڕان لەکەندی ژیانا
بۆ ئاسۆی خەیاڵ غلۆر دەبمەوە
داری ئومێدم کلۆر دەبنەوە
سەرقافڵەیەکی  کاروانی مسکم
رەنجدیدەیەکی لێوبووی هەنسکم
ماچی خۆشنوودی لەپیاڵەی تەمەن
وردو خاشی کرد  تاوێری زەمەن
تۆ ئەی نەورەسی ئاسمانی تارم
داد ڕەسی شەوی سیاهی شارم
وەرە لەحوجرەی ماتو تەنهامدا
نەرم داباریّ بەسەر بالاّمدا
لەنێو بەرداغی مەیدا نۆشمکە
تاوێك لەم گرەی ناخ خامۆشمکە

**وەك شەستەباران   بڕژێ بەسەرما**
**تەژیمکە لەنێو ئەوینی نەرما**
**شنەی هالاوی هەناسەی فێنك**
**ئاودامانمکا هێوریی تك تك**
**هێدی بیکەوە بوخچەی نیازم**
**گوێ رادێرە بۆ رازی دڵخوازم**
**بشکێنە تاسەی لێو وشکی عومرم**
**تا توولی تەمی سۆما دادڕم**
**وەرە لەحەوشەی  بێ ئۆقرەی ماڵم**
**رایماڵە کپیی  ساڵەهای ساڵم**
**هەر رێبوارەکەی کەژی  ئەوینم**
**هەرقەتارەکەی سپێدەی ژینم**
**دەسا ئەی ئاسۆی گەڕیدەی شاران**
**داکە بەسەرما وەك تاوە باران**





## نووسەر لەچەند دێرێکدا

- سالّی ١٩٦٩ لەشاری کەرکوك لەدایك بووە.
- لەناوەڕاستی هەشتاکاندا یەکەمین دەقی شیعریی بلاوکردۆتەوە.
- ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (پێشکەوتن)ە.
- بەڕێوەبەری رادیۆی (پێشکەوتن)ە لەهەولێر.
- بەرپرسی بەشی رۆشنبیریی‌و راگەیاندنی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانە.
- لەزۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بابەتو بەرهەمی هەمەجۆر بلاودەکاتەوە.

لەبلاوکراوەکانی نووسەر:

- خەندە لەباوەشی فرمێسکا   شیعر ١٩٩٢
- وەسێتەکانی هەڵم   شیعر / هاوبەش ١٩٩٧
- ئادارو هۆزان   شیعر / هاوبەش ٢٠٠١
- ئەیلوول و هۆزان   شیعر / هاوبەش ٢٠٠٢
- عەورەتی گەلا   شیعر / ٢٠٠٥